# پایەکانی ئیسلام بناسە


کۆکردنەوە و ئامادەکردنی

م. کازم محەمەد شێخانی





پێداچونەوە و پێشەکی

م. محەمەد مەلافائق شارەزووری



قال رسول الله (ﷺ)

﴿ بُنِيَ الإسلامُ عَلى خَمسٍ شَهَادَةُ أن لاَ إلَهَ إلَّا الله وَأَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ اللهِ وَ إقامِ الصَّلاَةِ وَ إيتَاءِ الزَّكاةِ وَحَجِّ البَيتِ وَ صَومِ رَمَضَانَ ﴾

أخرجه البخاري ومسلم



**Tanya Haji | تەنیاحاجی**

public channel



Description



🤍چەناڵێک تایبەت بە کتێب و بابەتی جیاواز🤍

Queen city
شاری شاژن
شارێک تایبەت بە کۆمەڵگایەکی جوان

لەلایەن ئاڤان بەهجەت کراوە بە pdf
بۆ خوێنەران

چەناڵ
https://t.me/tanyahaji7

بۆ ڕاوبۆچون و پسیار بۆ کتێب مەینێرە↓
@tanyahaji22

ئەکاونت



# پایەکانی ئیسلام بناسە

کۆکردنەوەو ئامادەکردنی

م.کازم محەممەد شێخانی

پێداچونەوەی و پێشەکی

م.محمد ملا فائق شارەزووری





ناوی کتێب: پایەکانی ئیسلام بناسە
کۆکردنەوە و ئامادە کردنی: م. کازم محەمەد شێخانی
پێداچونەوەی: م. محمد ملا فایەق شارەزووری
تایپ کردنی: م.سەربست لطیف قادرکەرەمی
نۆبەتی چاپ: چاپی یەکەم
ساڵی چاپ: ٢٠٢٠
تیراژ: ١٠٠٠ دانە
لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی(١٧٩١)ی ساڵی (٢٠٢٠)ی پێدراوە.






# پێرست

## بەناوی خودای گەورەو میهرەبان

سوپاس و ستایش بۆ پەروەردگاری جیهانیان، وە صەلات و سەلام لەسەر پێغەمبەرمان بێت، وە لەسەر خانە وادەو یارانی بێت، پێم باش بوو وەکو موسڵمانێک خزمەتێک بەم ئاینە پیرۆزەی ئیسلام بکەم بەوەی پایەکانی ئیسلام بەشێوەیەکی پوخت ئامادە بکەم، بۆ ئەوی تاکی کوردی موسڵمان سوودی لێ وەربگرێت و ببێتە مایەی شارەزا بوونیان لە ئاینەکەی پەروەردگار، وە داواکارم لەپەروەردگار نیەتمان پاک و دڵسۆز بکات، وە مەبەستمان تەنها رەزامەندی ئەو بێت (ئامین).

٢٠١٩/٧/١١ ڕۆژی پێنج شەممە.



بسم الله الرحمن الرحيم

الحمدللـه والصـلاة والسـلام علـى رسـول للـه (ﷺ) ومـن والاه أمـا بـعـد:

پـەرتوکی (پایەکانـی ئیسـلام بناسـە) لـە نووسـینی م.(کاظـم محمـد شـێخانی) پەرتوکـێکی نایـابە لـە بابەتەکـەی خۆیـدا زۆر چڕوپڕو کـورت وبـە بێـزە وە خـزمەتێکی زۆر بەرچـاو ودیـارە لـەم بابـەتەیـدا، هیـوادارم جـێ سـوود بێـت بـۆ هـەمـوو لایـەک.

براتان/محـمـد مـلا فـائـق شـارەزووری

٢٠٢٠/٥/٥

ئاینـی ئیسـلام لەسـەر پێنـج بنچینـە دامـەزراوە، هـەر وەكـو پێغەمبـەری خـودا (دووری خـوای لەسـەر بێت) فـەرمـوو یـەتی:

﴿(بُنِـيَ الإِسـلامُ عَلـى خَمـسٍ): (شهَادَةُ أن لاَ إلَهَ إلَّا الله وَأنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ اللـهِ وَ إقَـامِ الصَّـلاَةِ وَ إيتَـاءِ الزَّكَاةِ وَ حَـجِّ البَيـتِ وَ صَـومِ رَمَضَانَ﴾[1].

**واتە/** ئیسلام دامـەزراوە لەسـەرپێنج پایە:شایەتی دان بەوەی کـە هیـچ پـەرسـتراوێک بەڕاسـت (حـق) نییـە جگـە لـە (اللّـه)، وە محمد(درووودی خوای لـەسـەر بێـت).نێردراوی پـەروەردگارە-وە نوێژكرنـە-وە زەكـات دانـە- وە حـەج كردنـی ماڵـی خودایـە- وەڕۆژو گرتنـی مانگـی ڕەمەزانـە)، کەواتـە:-





١- أ خرجه البخاری برقم (٨) ومسلم (١٦).

# پایەی یەکەم

شهادة أن لا إله إلا الله

وَأَنَّ محمداً رَسُولُ الله

## بابەتەکانی ئەم بەشە

## مانای لا اله الا الله

دەبێت شایەتی بدەی بە زمانت و دانی پێدا بنێیت بە دڵت کە هیچ پەرستراوێک نییە بەڕاست و شایستەی پەرستن بێت جگە لە(الله)، لەبەر ئەوە نابێت هیچ پەرستراوێک بکرێتە هاوبەشیی(الله)، چ لە خەڵکی بێت یان فریشتەکان یان پێغەمبەران یاخود خۆر یان مانگ یان دارو بەرد یان پیاوچاکان یان شەهیدان......هتد. (لا إله إلا الله وحده). هەر لەبەر ئەم ووشەیە خوای گەورە هەموو پێغەمبەرانی پێ ی ڕوانە کردووە وەکو فەرمویەتی:

﴿وَمَا أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ مِن رَّسُولٍ إِلَّا نُوحِي إِلَيْهِ أَنَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا أَنَا فَاعْبُدُونِ﴾ [الأنبياء ٢٥]

واتە/وە لەپێش تۆیشدا ئەی محمد (درووودی خوای لە سەر بێت) هیچ پێغەمبەرێکمان نەناردووە، ئیلا سروش(الوحی) مان بۆ ناردووە، کە هیچ پەرستراوێک بەڕاست نییە شایەنی پەرستن بێت جگە لە(اللە). کە تاک و تەنهاو بێ هاوبەشە، بۆیە بە تاک و تەنها پەرستشی(عبادە) من بکەن، هەروەها خوای گەورە فەرموویەتی:

﴿ وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولًا أَنِ اعْبُدُوا اللَّهَ وَاجْتَنِبُوا الطَّاغُوتَ ﴾ [النحل ٣٦]

واتە/بەدڵنیایی ئێمە بۆ هەموو کۆمەڵ و نەتەوەیەک لە هەر شوێنێک ژیابێتن پێغەمبەرێکمان(صەلات و سەلامی خوای لێبێت) ناردووە، بە خەڵکیان وتووە ئەی خەڵکینە بەتاک و

تەنها خوای گەورە بپەرستن و هاوبەشی بۆ دا مەنێن وە خۆتان دوور بخەنەوە لە تاغوتانی وەکو:(شەیتان و فاڵچیان و جادووگەران و بتان و وە هەموو کەسێک کە بپەرسترێت و ڕازی ببێت بەو پەرستنە، یان بانگەوازی خەڵکی بکات بۆ پەرستنی خۆی، یان باوەڕی بە فەرمانی(بەحوکمی) خوای گەورە نەبێت و بە کۆنە پەرستی بزانێت، یان حوکمێکی تر بەباشتر بزانێت لە حوکمی خوای گەورە وە شوێنی بکەوێت یان یەکسانی بکات بە حوکمی خوا.

* جا هەرکەسێ مافی(حق) (لا إلە إلا اللە) بدات و وە لە دڵیەوە دانی پێدا بنێت و وە ئەوەی کە ئەیخوازێت باوەڕی پێ بهێنێت و ئیشی پێ بکات ئەوە دەچێتە بەهەشتەوە هەروەک پێغەمبەری خوا (دووردی خوای لە سەر بێ) فەرموویەتی:

(مَن كَانَ آخِر كَلَامِهِ مِنَ الدُنيا لاَ إِلَه إلاَّ الله دَخَلَ الجَنَّةَ)[1].

واتە/ هەر کەسێ کۆتا ووشەی لە دونیادا(لا إلە إلا اللە) بێت دەچێتە بەهەشتەوە، هەر لەبەر ئەمە بوو پێغەمبەری خودا(درووی خوای لەسەر بێت) (١٣)ساڵ لە مەککە مایەوەو بانگەشەی هاوبەش دەرانی دەکردو پێیانی دەفەرموو:

(قُولُوا لا إله إلا الله تُفلِحوا)

واتە/ بڵێن هیچ پەرستراوێک بەڕاست(حق) شایستەی پەرستن نییە جگە لە(اللە) سەرفەراز دەبن.

---

(١) أخرّجه أبو داود برقم (٣١١٦) و أحمَد (٢٢٠٣٤) والترمذي (٩٧٧) وصحّحه الألباني.

هەروەها فەرمووویەتی: (مَن قَالَ لاَ إِلَه إلاَّ الله، وَكَفَرَ بِمَا يُعبَدُ مِن دُونِ اللهِ، حَرُمَ مَالُه وَدَمهُ وَ حِسَابُهُ عَلى اللهِ عَزَّ وَ جَل)[1].

واتە/هەر کەسێ بڵێت هیچ پەرستراوێک بەڕاست (حق) شایستەی پەرستن نییە جگە لە(الله)، وە بێ باوەڕ بێت بەوەی ئەپەرسترێت جگە لە(الله)ئەوە سامان و خوێنی پارێزراوە لە دونیا هیچ کەس بۆی نییەخوێنی بڕێژێت بە ناڕەوا، وەسەروەت و سامانیشی داگیر بکات بەناڕەوا، وە لێکۆڵینەوەشی لای پەروەردگارە لە ڕۆژی دواییدا.

کەواتە (لاالە الا اللـە ) ووشەیەکی گەورەیە بەڵکو گەورەترین ووشەیە کە هەموو بونەوەران لە بەر ئەم ووشەیە دروست کراون وەکو خوای گەورە فەرموویەتی:

﴿ وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ﴾ [الذاريات٥٦] أی ( ليوحدون) واتە: من هەر بۆیەجنۆکەو ئادەمیم دروست کردووە بم پەرستن وبم ناسن. هەروەها ئەم وشەیە حەقی خوای گەورەیە بە سەر بە ندەکانیەوە، وە ووشەی ئیسلام بوون و کلیلی بەهەشتە، بۆیە گەورەیی ئەم ووشەیەو پێگەو شوێنی لە شەریعەدا زۆرزیاترە لەوەی کە باس دەکرێت لەلایەن زاناو بانگخوازانەوە، لەمەوە بۆمان ڕوون دەبێتەوە پێویستە زاناو شارەزا بین دەربارەی ئەم ووشەیە لە گەڵ کار کردن بە ماناکەی وراست گۆبوون لە گەڵیدا،چونکە بە شارەزا بوون رزگارمان دەبێت لە ڕێبازی گاورەکان کە کردەوە ئەنجام دەدەن بەبێ زانست،وەبەکارکردن بە ماناکەی

(١) رواه مسلم برقم (٢٣)

رزگارمان دەبێت لە ڕێبازی جووەکان کە زانست وزانیاریان هەیەو کاری پێ ناکەن، وەبە ڕاست گۆبوون رزگارمان دەبێت لە ڕێبازی دوو ڕووەکان کە لە ڕووکەشدا خۆیان بە موسڵمان دەزانی بەڵام لە ناخدا ڕاستیان نەدەکرد،کەوابوو ئەم ووشەیە کاتێک سوودی هەیە بۆ خاوەنەکەی ئەگەر ئیش بە ماناکەی بکات لە ژیانی ڕۆژانەیدا، وە لە ناخیدا باوەڕی پێ هەبێت،وە خۆی دوور بگرێت لە هاوبەش دانان، چونکە هاوبەش دانان بۆ خوای گەورە کردەوەکان پوچەڵ دەکاتەوە، هەر وەک خوای گەورە فەرمویەتی:

﴿لَئِنْ أَشْرَكْتَ لَيَحْبَطَنَّ عَمَلُكَ﴾ [الزمر٦٥] **واتە/** ئەگەر هاوبەش بۆ خوای گەورە بڕیار بدەی ئەوە کردەوەکانت هەموو پوچەڵ دەبێتەوە.

## ماناى محمداً رسول الله

واتە گەواهی بدەی کە محمد کوڕی عبداللە نێردراوی پەروەردگارە بۆ هەموو جهانیان بە مرۆڤ و جنەوە وەکو خوای گەورە فەرموویەتی:

﴿وَمَا أَرْسَلْنَٰكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَٰلَمِينَ﴾ [الأنبياء١٠٧] **واتە/** ئێمە هەر بۆیە تۆمان نارد کە ڕەحمەت و بەزەی و میهرەبانییەک بیت بۆ هەموو جیهانیان..

* لەبەر ئەوە پێویستە لەسەر هەموو جیهان باوەڕی پێی بێنن، کە نێردراوەی پەروەردگارە، وە باوەڕ بەوە بێنن کە دوای ئەو هیچ پەیامبەرێک نایەت، هەروەکو خوای گەورە فەرموویەتی:

﴿وَخَاتَمَ النَّبِيِّنَ﴾ [الأحزاب:٤٠] بۆیە هەر کەسێک بانگەشەی ئەوە بکات کە پەیامبەرە لە دوای محمد (درووودی خوای لەسەر بێت) ئەوە بێ باوەڕ دەبێت، وە هەروەها ئەو کەسانەش بێباوەڕ دەبن کە باوەڕی پێ دەکەن.

* هەروەها پێویستە باوەڕ بە هەموو ئەو هەواڵانە بکریت، کە پێغەمبەری خودا (درووودیٰ خوای لەسەر بێت) باسی کردووە وە گوێڕایەڵی بکرێت لەو کارانەدا کە فەرمانی پێ کردووە، وەدوور بکەوینەوە لەو کارانەی کەقەدەغەی (نَهی) لێکردووە، وە پەرستش ئەنجام بدەین بەو شێوەیەی کە بۆ مانی داناوە، وە زیادەڕەوی نەکەین لە مافیدا وەکو خۆی فەرموویەتی:

(لاَ تَطرُونِي كَمَا أَطرَتِ النَّصَارى ابنَ مَريَم، فَأَنَّمَا أَنَا عَبدٌ فقُولُوا عَبدُ الله وَرَسُولُه)[1]. واتە/زیادە ڕەوی لە مافی(حق) مندا مەکەن هەر وەکو گاورەکان زیادەڕەویان کرد لە مافی عیسای کوڕی مەریەم، بەڵکو من بەندەی خوام، بۆیە بڵێن بەندەی خوایەو پێغەمبەری خوایە(دوردی خوای لەسەر بێ)، هەروەها نابێت زیادەڕەوی لەیاسای(شریعة) پەروەردگاردا بکرێت، وەکو ئەوانەی کەزیادەڕویان کرد بەبێ ئەوەی پێغەمبەری خوا(دوردی خوای

(١)رواه البخاري برقم (٣٤٤٥) وأحمد (١٥٤).

لەسەربێ)، فەرمانی پێ کردبێت، هەر لەبەر ئەمەیە پێغەمبەری خوا(دوردی خوای لەسەر بێ) فەرموویەتی:

(مَن عَمِلَ عَمَلاً لَيسَ عَلَيهِ أمرُنَا فَهُوَ رَد).[1] واتە/هەر کەسێ کردەوەیەک ئەنجام بدات و فەرمانی ئێمەی لەسەر نەبێت ئەوە وەرناگیرێت.

* ئەم زیادەڕەویەش دەبێتە دوو بەشەو:-

١- زیادەڕەوی لەبیرو باوەڕو عەقیدەدا:-وەکو بیروباوەڕی گروپە لادەرەکان نموونەی جەهمییەکان و موعتەزیلەکان و ڕافیزەکان.....هتد، کە زیادە ڕەویان ئەنجام دا لە ناوو سیفەنەکانی پەروەردگاردا.

٢-زیادەڕەوی لەپەرستنەکاندا:وەکو ئەنجام دانی پەرستشێک کە هیچ بەڵگەیەکی یاسایی (دَليل الشَّرعي) لەسەر نەبێت، یان ئەنجام دانی ئەو کارانەی کە دەبنە هۆکارێک بۆ هاوبەشی دانان بۆ خوای گەورە، وەکو: دروست کردنی مەزارگە لەسەر گۆڕەکان و ئەنجام دانی نوێژ لایان و بەگەورە دانانیان و پارانەوە لەسەریان، بۆیە ئەنجام دانی ئەم کارانە دروست نییە و زیادەڕەوییە لەشەرعدا.

(١)رواه مسلم برقم (١٧١٨) وأحمد (٢٥٤٧٢).

## پاکێتی (الطّهارَة)

پێش ئەوەی باسی پایەی دووەم بکەم کە نوێژە، پێم باشە باسێک لە پاکێتی بکەم، چونکە یەکێک لە مەرجەکانی نوێژ پاکێتییە، نوێژ بەبێ پاکێتی دانامەزرێت.

* پاکێتی(الطَهارَة)):- واتە لادانی حەدەثە (بێ دەس نوێژی-لەش گرانی) یان لابەردنی پیساییە لەسەر خۆت وەکو دەس نوێژ گرتن یان خۆشۆردن و خۆ پاکردنەوە.

## پاکێتی دابەش دەبێت بۆ دوو بەش

١- واتایی-ناخی (معنوی):- وەکو خوای گەورە فەرموویەتی:

﴿خُذْ مِنْ أَمْوَٰلِهِمْ صَدَقَةً تُطَهِّرُهُمْ﴾ [التوبة ١٠٣] واتە/ ئەی محمد (دروودی خوای لەسەر بێت)لە ماڵەکانیان خێر و زەکات وەربگرە کە بەهۆیەوە پاکیان ئەکەیتەوە لە تاوان.

٢-هەست پێکراو(حسي):-وەکو خۆپاکردنەوە لە لەش گرانی و بێ دەست نوێژی و خۆپاک کردنەوە لە پیسایی.

## ئاوەکان و جۆرەکانی

١- ئاو بەگشتی(الماء المطلق):-

حوکمی ئەم ئاوە پاکەوپاک کەرەوەشە، واتە خودی خۆی پاکەو وەشتە پیسەکانیش پاک دەکاتەوە، وەکو:

أ-ئـاوی بـاران و بەفرو تـەرزە:- واتـە ئـەوەی لـە ئاسـمانەوە دادەبەزیتـە خـوارەوە وەکوخـوای گـەورە فەرموویەتـی:

﴿وَأَنزَلْنَا مِنَ السَّمَاءِ مَاءً طَهُورًا﴾ [الفرقان ٤٨] واتـە/ وە لـەو ئاسمانـەوە ئاوێکی پاک و خاوێنکەرمان ناردە خوارەوە.

ب-ئـاوی دەریـاو ڕووبـارو کانیاوەکان:-واتـە ئـەوەی لـە زەوییـەوە هـەڵ دەقوڵێت.

ج-ئەو ئاوەی ڕەنگی دەگۆڕێت بەهۆی زۆر مانەوەو:-

یـان بەهـۆی ڕەنگی شوێنەکەوە یان خاکەکەیەوە یان بەهۆی تێکەڵ بوونی لەگەڵ شتێکی پاکدا وەکو قـەوزە یان گەڵای دارو درەخت.

٢-ئاوی بەکارهاتوو(الماء المستعمل):-

واتەپاشـماوەی ئەو ئـاوەی کە بەکـاردێت لـە ئەندامـەکانی لـەشدا، چ لەکاتـی دەسـت نوێژدابێت یـان لەکاتـی خۆشـۆردندا بێـت.

*حوکمـی ئـەم ئاوە:- پاکەو پاکەرەوەشـە لەبـەر فەرموودەکەی ئیبن عەقیل کە فەرموویەتـی: (أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) مَسَحَ بِرَأْسِهِ مِن فَضلِ مَاءٍ كَانَ فِي يَدِهِ)[1].

واتـە/بـەڕاسـتـی پێغەمبـەری خـودا(دروودی خـوای لەسـەر بێت) دەسـتی هێنا بەسـەریدا واتـە مـەسحی سـەری کرد بـەو ئاوەی

(١)حَديث حَسَن/أخرَجه أبوداودبرقم (١٣٠).

کە مابوو بەدەستی یەوە کەواتە ئاوی تازەی هەڵنەگرتەوە بۆ مەسحی سەری، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر دروستی ئاوی بەکارهاتووە، کە پاکەو پاکەرەوەشە، هەرچەندە ڕاجیاوازی هەیە لە نێوان زانایاندا لەم بوارەدا وەکو یەکێک لە ووتەکانی حەنابیلەکان کە دەڵێن ئاوی بەکارهاتوو پاکە، بەڵام پاکەرەوە نییە.

٣-ئاویَ کە شتی پاکی تێکەڵ بووبێت:-

ئەو ئاوەی شتی پاکی تێکەڵ بووبێت وەکو سابون و ئارد و زەعفەران و ماست و هاو شێوەی ئەمانە، حوکمی ئەم ئاوە پاکەو پاکەرەوەشە بە مەرجێک ناوی ئاوی ڕەهایی (الماءُ المُطلَق) پێوە مابێت، بەڵام ئەگەر لە ناو ئاوی ڕەها دەرچووبێت وەکو ئەوەی ببێت بە ماستاو یان شەربەتاو یان ئاردەوا یان سابوناو بە جۆرێک نەتوانیت پێی بڵێیت ئاو، ئەوە پاکەبەڵام پاکەرەوەنییەو ناتوانیت شتی تری پێ پاک بکەیتەوە یان دەس نوێژی پێبگریت، بەڵام خودی خۆی پاکەو گەربدات لە لاشەت یان جلەکەت پیسی ناکات.

٤-ئاویَ کە شتی پیسی تێکەڵ بووبێت:-

ئەو ئاوەی کە شتی پیسی تێکەڵ بوو دوو شێوازی هەیە:-

١-ئەگەر پیسییەکە تام یان بۆن یان ڕەنگی ئاوەکەی گوڕی بێ، ئەوە لەم کاتەدا دروست نییە شتی پێ پاک بکرێتەوە بە کۆی زانایان.

٢-ئەگەر ئاوەکە وەک خۆی مایەوە، وە یەکێک لە سیفەتەکانی نەگۆڕی وەکو(تام-بۆن-ڕەنگ) ئەوە پاکەو پاکەرەوەشە کەم بێ یان زۆر لەبەر فەرموودەکەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) کە فەرموویەتی:

(المَاءُ طَهُورٌ لاَ يُنَجِسُهُ شَيء)[1] واتە/ئاو پاکە هیچ شتێک پیسی ناکات، بەڵام بە مەرجێک یەکێ لە سیفەتەکانی نەگۆڕێت، بەلام لای هەندێ لە زانایان ئاو ئەگەر کەم بوو وە پیسایی تێکەوت ئەوە پاک نییە، ئەگەر یەکێک لە سیفەتەکانیشی نەگۆڕێت، لەبەر فەرموودەکەی پێغەمبەر (ﷺ) کەفەرموویەتی:

(إذا كَانَ المَاء قُلَّتَينِ لَم يَحمِلِ الخَبَثَ )[2]. واتە/ ئەگەر ئاو گەیشتە ڕادەی قولەتەین پیسی هەڵناگرێت لەبەر ئەمە هەندێ لە فوقەها بە تێگەیشتن لەم فەرموودەیە فەرموویانە: کەواتە ئەگەر ئاو کەمتربوولەڕادەی قولەتەین (کە نزیکەی (٢٠٠) لیترە)پیسی هەڵ دەگرێت کە پیسی بەرکەوێت، ئەگەر یەکێ لە سیفەتەکانیشی نەگۆڕێت، ئەمەش بۆچوونی حەنەفییەکان و زۆربەی حەنابیلەکانە، بەڵام ڕای پەسەند(راجح) ئەوەیە ئاو پیس نابێت هەتا یەکێک لە سیفەتەکانی نەگۆڕێت، والله أعلم.

---

(١)صحيح /أخرجهَ أبوداودبرقم (٦٦)والترمذی (٦٦)و أحمَد (١١٨١٥) و غيره.

(٢)أخرجه أبو داود برقم (٦٣)، و صححه الألباني.

## دەست نوێژ (الوضوء)

دەس نوێژ مەرجە بۆ تەواوێتی نوێژ، بە بەڵگەی فەرموودەکەی ئەبوهورە یرە کە پێغەمبەری خوا(دروودی خوای لە سەر بێت) فەرموویەتی: (لاَ يَقبَلُ اللهُ صَلاَةَ أَحدِكُم إِذَا أَحدَث حَتَّى يَتَوَضَّأَ)[1].

واتە/خوای گەورە نوێژی هیچ کەستان وەرناگرێت ئەگەر توشی بێ دەس نوێژی بوو هەتا دەس نوێژ نەگرێت، هەر لەبەر ئەمەیە ئیمام نەوەوی فەرموویەتی ئومەت (أُمَة) کۆکن لەسەر ئەوەی هەرکەس نوێژ ئەنجام بدات بەبێ دەس نوێژ لە کاتێکدا کە ئەتوانێت دەس نوێژ بگرێت، نوێژەکەی بەتاڵە وەپێویستە لەسەری نوێژەکەی دووبارە بکاتەوە بە ووتەی تێکرای زانایان، چ بە ئەنقەست یان لە بیرچوونەوە یان نەزانین بێت، وە هەروەها فەرموویەتی:دەس نوێژ مەرجە بۆ تەواویەتی نوێژ، وەنوێژ دانامەزرێت بەبێ دەس نوێژ چ بە ئاو بێ یان بە تەیەمووم بێت ئەگەر ئاو نەبوو.

## چۆنێتی دەس نوێژ گرتن

١-نیەتی دەس نوێژ دەهێنێ لە دڵەوە.

٢-بەناوی خوا(بسم الله) دەس پێ دەکات.

٣- دەستەکانی (٣) جار دەشۆرێت.

٤-ئاو لە دەم و لووتی وەردەدات (٣) جار.

(١)أخرَجه البخاري برقم (١٣٥) ومسلم (٢٢٥).

٥-دەم و چاو دەشۆرێت (٣) جار، لەگەڵ دەس کردن بەناو ڕیشدا بۆ ئەوەی بەجوانی تەڕبێت.

٦-دەستەکانی هەتا سەروو ئەنیشک(قۆڵ) دەشۆرێت، دەستی ڕاست پاشان دەستی چەپ، لە گەڵ دەس کردن بەناو پەنجەکانی دەسدا.

٧-دەست دەهێنێ(مسح)ی سەر لە پێشەوە هەتا پشتی سەر پاشان گەڕانەوەی بۆ پێشەوە، لەگەڵ ناوەو دەرەوەی گوێچکەکاندا.

٨-قاچەکان هەتا سەروی قولەپێ، لەگەڵ دەس کردن بەناو پەنجەکانی پێدا.

## ئایا نیەت هێنان مەرجە(الشرط) بۆ پاکێتی (دەس نوێژ-خۆشتن تەیەمووم) کردن

زانایان سێ بۆ چوونی جیاوازیان هەیە لەم بوارەدا:-

١-نیەت هێنان مەرجە بۆ تەواوێتی دەس نوێژ وخۆشۆرن و تەیەمووم کردن کە بۆ چوونی زۆربەی زانایانە (جمهور العلماء)، بەبەڵگەی فەرموودەکەی ئیمام عمر(ڕەزای خوای لێبێت) کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەربێ) فەرموویەتی:

(إِنَّمَا الأَعمَالُ بِالنِّيَات)[١]. واتە/بەڕاستی وەرگرتنی (قبوڵ بوونی) کردەوەکان بەپێی نیازەکانە (نییەتەکانە).

---

(١)أخرَجه البخاري برقم (١) والمسلم (١٩٠٧).

٢-نیـەت هێنـان مـەرج نییـە بـۆ تـەواوێـتی دەس نـوێژو و خۆشـتن و تەیەمـووم، ئەمـەش بۆچوونـی ئەوزاعـی و حەسـەنی کـوڕی صاڵـحـه.

٣-نیـەت هێنان مەرج نییە بۆ تەواوێتی دەس نوێژ و خۆشتن، بـەڵام مەرجـە بـۆ تەواوێتـی تـەیـەمووم، ئەمـەش بۆچوونـی پێشـەوا ثـەوری و ئەبـو حـەنیفەیە، بـەڵام بۆچوونـی - ووتـەی پـەسەند: ئـەوەی یەکەمـە. الله أعلم.

## حوکمی(بسم الله) لەکاتی دەس نوێژدا

بسـم الله کـردن لـە کاتـی دەس نوێژدا لـە فەرمـوودە ڕاست و دروستەکاندا نەهاتـووە، کـە باسـی چۆنێتـی دەس نوێژگرتنی پێغەمبەری خـوا(درودی خـوای لەسـەر بێـت) دەکات، بـەڵام لـە چەندین فەرمودەی تردا هاتـووە کە بـاس لـە بسـم اللـه کـردن دەکـات لـەکاتی دەس نوێژدا کە هەمـووی لاوازەو ناکرێتـە بەڵگە. مسک الختام شرح عُمدَه إلاحکام (زاید بن حسن الوصابی).

## وتەی زانایان لەم بوارەدا

١-بسـم اللـه کـردن لـە کاتـی دەس نوێـژدا سـونەتە وئـەرک (واجب)نییـە، کـە بۆچوونـی زۆربـەی زانایانـە.

٢- بسـم الله کـردن لـە کاتـی دەس نوێژدا واجبە، ئەمـەش یەکێکە لە وتەکانی ئیمام ئەحمـەد و هـەندێ لە زانایانی ترە.

٣- بسم الله كردن له كاتی دەس نوێژدا سونەت نییە، ئەمەش بۆچوونی پێشەوا ئەبوو حەنیفەیە لە یەکێک لە وتەکانی، وە لە یەکێک لە وتەکانی پێشەوا مالیک زیادەیە(بیدعەیە).

بەڵام بۆچوونی پەسەند بۆچوونی یەکەمە کە دەفەرموون سونەتە، وەپێشەوا بوخاریش بە شێکی داناوە لە کتێبەکەیدا، بەشی (بسم اللە) کردن لەهەموو کاتێکدا.

## حوکمی ئاو لە دەم و لووت وەردان

بە هەمان شێوە زانایان جیاوازیان هەیە لەم بوارەدا لە چوار بۆچووندا:-

١-ئاو لەدەم و لووت وەردان واجبەلەکاتی دەس نوێژ و خۆشتنی لەش گرانی.

٢- ئاو لەدەم و لووت وەردان سونەتە لەکاتی دەس نوێژ و خۆشتنی لەش گرانیدا(جنابە).

٣- ئاو لەدەم و لووت وەردان واجبە لە کاتی خۆشتنی لەش گرانیدا، بەڵام لە کاتی دەس نوێژگرتندا واجب نییە.

٤- ئاو لە لووت وەردان لەکاتی دەس نوێژو خۆشتنی لەش گرانیدا واجبە، نەک ئاو لەدەم وەردان، بەڵام بۆچوونی پەسەند بۆچوونی یەکەمە کە دەفەرموون ئاو لەدەم و لووت وەردان واجبە لە کاتی دەس نوێژ و خۆشتنی لەش گرانیدا، واللە أعلم.

## حوکمی سڕینی-مەسحی-گوێ یەکان

لەم بوارەشدا زانایان جیاوازیان هەیە:

١-زۆربەی زانایان لەسەر ئەو بۆچوونەن کە مەسحی گوێ یەکان سونەتە، هەر وەکو ئیبن جەریری تەبری فەرموویەتی:زانایان لەسەر ئەوە کۆکن کە کەسێ واز لە مەسحی گوێ یەکان بهێنێت دەس نوێژەکەی تەواو، وە ئیبن حەزمیش فەرموویەتی:مەسحی گوێ یەکان فەرز نییە.

٢-مەسحی گوێ یەکان واجبە ئەمەش بۆچوونی هەندێ لەمالکییەکانە و یەکێک لە ووتەکانی پێشەوا ئەحمەدە، وە بۆچوونی پێشەوا ئەلبانیشە، بەڵام ڕای پەسند ئەوەی یەکەمە، کەفەرموویانە سونەتە. والله أعلم.

## ئایا پێ یەکان دەشۆردرێن یان مەسح دەکرێن

١- شۆردنی پێ یەکان واجبە، لای زۆربەی زانایان، بەڵام پێشەوا ماوردی فەرموویەتی:شۆردنی پێ یەکان فەرزە لای هەموو فوقەهاکان، نەک مەسح کردنیان، بەڵگەشیان وشەی (وَأَرجُلَكُم) لە سورەتی مائیدە ئایەتی/٦پیتی لامەکەی بە سەرە(الفتحە) دەخوێننەوە کە عەتفی(عەطف) دەکەن بۆ سەر وشەی (وَأَيدِيَكُم) کە بەشۆردن هاتووە،

٢-مەسح کردنی پێ یەکان واجبە لای پێشەوا عەلی و ئیبن عەباس و ئەنەس (رضي الله عنهم)، بەڵام زانای پایە بەرز ئیبن حەجەر

فەرمووبەتی:جێگیر بووە کە ئەم هاوڵانەی(سەحابانەی) پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) پەشیمان بونەتەوە لە بۆچوونەکەیان، هەروەها مەسح کردنی پێ یەکان بۆچوونی عیکرمەو حەسەن و شەعبی و ئاین زای (مذهب) شیعەشە، چونکە ووشەی (وَأَرْجُلَكُمْ) بە (وَأَرْجُلِكُمْ) بەژێرەی (کسرەی) لامەکە دەخوێننەوە کە عەتفی(عەطف) دەکەن بۆ سەر ووشەی (رُؤُسِكُمْ) کە بە مەسح کردن هاتووە.

٣-فەرموویانە ویستی خۆتە پێ یەکان دەشۆی یان مەسحی دەکەی، ئەم بۆ چوونەش دەدرێتە پاڵ ئیبن جەریری تەبەری و ئەوزاعی وثەوری و هەندێ لە زانایانی تر، بەڵام بۆ چوونی پەسەند ئەوەیە کە پێ یەکان بشۆردرێت، مەگەر خوف یان گۆرەوی لە پێ یەکاندا بوو درووستە مەسح بکرێت بە مەرجی تایبەتی خۆی.

## حوکمی ڕیزبەندی(الترتیب) لە ئەندامەکانی دەس نوێژدا

ڕیزبەندی/ واتە شۆردنی ئەندامەکان لە کاتی دەس نوێژدا پاش و پێش نەکرێت.

## وتەی زانایان

١-ریزبەندی لە ئەندامەکانی لەش لەکاتی دەس نوێژدا واجبە لای پێشەوا عوسمان وئیبن عەباس ویەکێ لە ووتەکانی پێشەوا عەلی، هەروەها ڕێبازی شافعی و حەنابیلەکانیشە، بەڵگەیشیان ووتەی پەروەردگارە کە فەرموویەتی:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا قُمۡتُمۡ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ فَٱغۡسِلُواْ وُجُوهَكُمۡ وَأَيۡدِيَكُمۡ إِلَى ٱلۡمَرَافِقِ وَٱمۡسَحُواْ بِرُءُوسِكُمۡ وَأَرۡجُلَكُمۡ إِلَى ٱلۡكَعۡبَيۡنِ﴾ [المائدة ٦] کە لەم ئایەتەدا ئەندامەکانی دەس نوێژ بە ڕیزبەندی باس کراوە.

٢- ریزبەندی لە ئەندامەکانی لەش لەکاتی دەس نوێژدا واجب نییە لای ئیبن مەسعودو یەکێ لە ووتەکانی پێشەوا عەلی، هەروەها ڕێبازی پێشەوا مالیک و ثەوری و حەنەفیێکانیشە، بەڵگەشیان ئەوەیە کە دەفەرموون خوای گەورە بە (واو)ی عەطف باسی ئەندەمەکانی لەشی کردووە لە کاتی دەس نوێژدا، وە(واو)ی عەتفیش بۆ ڕیزبەندی نییە، هەروەها پێشەوا ئەلبانیش فەرموویەتی ڕیزبەندی لە ئەندامەکانی لەش لەکاتی دەس نوێژدا سونەتە.

## پایەکانی دەس نوێژ (أرگان الوضوء)

١-شوشتنی هەموو دەم و چاو،

٢-شوشتنی دەستەکان هەتا ئەنیشک،

٣-سڕینی (مەسحی) سەر،

٤-شوشتنی پێ یەکان هەتا قولەپێ.

## جیاوازی نێوان پایە و(رُكن) مەرج و(شرط) پێویستی و (واجب) سونەت(سنە)

١-پایە (رُكن)و مەرج(شرط): ئەگەر ئەنجام نەدرێت لەپەرستەکاندا ئەوە ئەو پەرستنە پوچەڵ دەبێتە.

٢-پێویستی(واجب): ئەگەر ئەنجام نەدرێت لە پەرستنەکاندا ئەوە ئەو پەرستنەپوچەڵ نابێتەوە، بەڵام کەسەکە تاوانبار دەبێ بەئەنجام نەدانی.

٣-سونەت: ئەگەر ئەنجام بدرێت لە پەرستنەکاندا پاداشتی لەسەر وەردەگرێت، بەڵام گەر ئەنجام نەدرێت تاونبار نابێت.

## هەڵوەشێنەرەوەکانی دەس نوێژ (نواقص الوُضوء)

١-ئەوانەی لەپاش و پێشی مرۆڤ دەردەچێت، وەکو:(میز-پیسی- مەنی- وەدی- مەزی- بۆن-دەنگ- ئەمانە دەس نوێژ دەشکێنن بە تێکڕای زانایان).

*مەنی/ئەو ئاوەیە کە لەکاتی جووت بوون(جِمَاع) یان ئارەزوو (شەهوەت) بەرزیدا دەردەچێت، کە خۆ شتنیش دەکەوێتە سەر کەسەکە.

*مە ذي/ ئەو ئاوەیە کە لەکاتی بیرکردنەوە یان یاری کردن لەگەڵ خێزان دەر دەچێت.

*وەدی/ئـەو ئاوەیـە کـە لـە پـاش میـز دەر دەچـێت، بەبێ شـەهوەت.

هـەروەهـا ئـەوانەش کـە کـەم جار لـە مرۆڤـەوە دەر دەچێت وەکو(خوێن-کرم-بـەرد- یـان هـەر شـتێکی تـری هـاو شـێوەی ئەمانـە، لای زۆربـەی زانایـان دەس نـوێژ دەشـکێنن، بـەڵام لای هەنـدێ لـە زانایانیـش ئـەم شـتانە دەس نوێـژ ناشـکێنن.

٢-خـەوی قوڵ بـەجۆرێ کـەسەکە ئاگای لە خۆی نـەبێت.

٣-نـەمـانی عەقڵ و ژیری بە لـە هـۆش خۆچوون بێت یان بە نەخۆشی یان بەسـەر خۆشـی یـان هـەر هۆکارێکی تر بێت، هـەر وەکو پێشـەوا نـەوەوی

فـەرموویـەتـی:ئومەت (أُمَة) کۆکن لەسـەر ئـەوەی کـە دەس نوێژ دەشکێت بە شێـتی و لـە هـۆش خۆچوون.

## ئەو شتانەی کە زانایان ڕا جیاوازیان هەیە لەسەری کە ئایا دەس نوێژ دەشکێنێت یان نا

١-دەسـت دان لـە ئافـرەت:-زانایان جیاوازیـان هەیـە کـە ئایا دەس دان لـە ئافـرەت دەس نوێـژ دەشـکێنێت یـان نایشـکێنێت دابـەش بـوون بـۆ سـێ بۆچـوون:-

أ-لای پێشەوا ئەبو حەنیفەو ئیبن تەیمییە و ئیبن عوسەیمین و یە کێک لە ووتەی حەنابیلەکان ناشکێت.

ب-لای شافعییەکان و ڕووکەشەکان(ظاهرية) وئیبن عومەرو ئیبن مەسعود دەشکێت.

ج-لای پێشەوا مالیک و یەکێ لە ووتەکانی حەنابیلەکان ئەگەر بە ئارەزوو (شهوة) بوو دەس لێدانەکە دەشکێت، وە بەپێچەوانەوە ئەگەر بە ئارەزووەوە نەبوو ناشکێت.

٢-دەست دان لە عەورەتی خۆت بەبێ جل:-زانایان ڕا جیاوازیان هەیە لەسەر دەست دان لە عەورەت بەبێ جل، ئایا دەس نوێژ دەشکێنێت یان نا، بەڵام ڕای پەسەند ئەوەیە ئەگەردەس لێدانەکە بە ئارەزووەو بوو دەشکێت، ئەگەر بە ئارەزووەو نەبوو ناشکێت، ئەمەش کۆکراوەی نێوان فەرموودەکانە.

٣- ڕشانەوە:-زانایان جیاوازیان هەیە لەسەری، کە ئایا ڕشانەوە دەس نوێژ دەشکێنێت یان نا، بەڵام بۆ چوونی پەسەند ئەوەیە کە دەس نوێژ ناشکێنێ، چونکە هیچ بەڵگەیەکی جیگیر نەهاتووە لەسەری یان لەم بوارەدا.

٤- خواردنی گۆشتی ووشتر:-زانایان ڕا جیاوازیان هەیە لەسەری ئایا خواردنی گۆشتی ووشتر دەس نوێژ دەشکێنێ یان نا، لای زۆربەی زانایان دەس نوێژ ناشکێنێ، بەڵام

فەرموویانە سونەتە دەس نوێژی بۆ هەڵبگیرێ، کە بۆچوونی پێشەوا(ئەبو حەنیفە و مالیک و شافعیە)، بەڵام ڕای پەسەند ئەوەیە کە دەس نوێژ دەشکێنێت، لەبەر فەرموودەکەی جابری کوڕی سەمەرە کە فەرمویەتی

(أَنَّ رَجُلاً سَأَلَ رَسُولَ اللهِ( ):قَالَ أَتَوَضَّأُ مِن لُحُومِ الإِبلِ؟ قَالَ:نَعَم)[1]،

واتە/پیاوێک پرسیاری لە پێغەمبەری خودا(دروودی خوای لەسەر بێ)کرد: فەرمووی دەس نوێژ بگرم لە گۆشتی وشتر، پێغەمبەری خوا(دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی:بەڵێ.

* هەروەها بەشەکانی تری ووشتر وەک (جگەرەکەی-سپڵەکەی-بەزەکەی-مەرگەکەی) هەمان حوکمی گۆشتەکەی هەیە.

## حوکمی دەس نوێژگرتن لەشیری وشتر

بەهەمان شێوە زانایان سێ بۆچونی جیاوازیان هەیە لەسەر خواردنی شیری وشتر:

١-خواردنی شیری ووشتر دەس نوێژ دەشکێنێت، هەر وەکو گۆشتەکەی، ئەمەش ووتەیەکە لە ووتەکانی حەنابیلەکان.

٢-دەس نوێژگرتن لەکاتی خواردنی شیری وشتردا سونەتە، بەپێی بۆچوونی ئیبن تەیمییە و شێخ عوسەیمین.

(١)أخرّجه مسلم(٣٦٠) وابن ماجه (٤٩٥).

٣-خواردنی شیری ووشتر دەس نوێژ ناشکێنێت، کە بۆچوونی زۆری زانایانە، فەرموویانە ئەو فەرمودانەی کە هاتوون باس لە هەڵگرتنی دەس نوێژ دەکەن لە شیری وشتر لاوازن، ئەم ڕایەش پەسەندە، والله أعلم.



## ابەتەکانی ئەم بەشە

یـەکێکی تـر لـە پایەکانـی ئیسـلام نوێـژ ئەنجـام دانەکـە دووەم پایەیـە، خـوای گـەورە فـەرزی کـردووە لەسـەر پێغەمبەرەکـەی(دروودی خـوای لەسەربێ)ڕاسـتەوخـۆ لەلایـەن خۆیـەوە لەشەوڕەویدا(ئیسـرا ومیعراجدا)هـەر لەبـەر ئەمـەیە نوێژ ئەنجـام دان گەورەتریـن پایـەی ئیسـلامە لـە دوای شـایەتومان (شَهادَة)، خـوای گـەورە یارمەتـی دەرمـان بێت بۆ ئەنجـام دانی نوێژەکانمـان.

## حوکمی ئەو کەسەی نوێژ ئەنجام نادات

هــەر کــەسێ نوێـژ ئەنجـام نـەدات و بڕوای بـە واجب بوونی نوێژ نەبێت، ئـەوە ئـەو کـەسە بێ باوەڕە بـە تێکڕای زانایان، بەڵام زانایان ڕا جیاوازیان هەیە لـەسەر ئـەو کـەسەی کـە نوێژ ئـەنجام نـادات لـەبـەر سستی و تەمبەڵی، لەکاتێکدا بڕاوی بە واجب بوونی هەیە، کە ئایا بێ باوەڕە یان نا:-

١-لای زۆربـەی زانایـان ئـەو کەسـەی نوێـژ ئەنجـام نـادات لـە بەر تەمبەڵی بێ بـاوەڕ نییە، بـەڵام تـاوانبـارەو تـاوانی گەورەی ئەنجامـداوە، کـە ئەمـەش بـۆچوونی پێشـەوایانی وەکو(ئەبـو حەنیفـە و شـافعی و مالیکییـە)، ووتەیەکـی پێشـەوا ئەحمەدیشـە.

٢-ئـەو کەسـەی نوێـژ ئەنـجام نادات لەبـەر تەمبەڵی وەبڕاوی

بە واجب بوونیشی هەیە بێ باوەڕەو دەرچووە لە ئاینی ئیسلام، ئەمەش بۆچوونی سەعیدی کوڕی جوبەیر و شەعبی و نەخەعی و ئەوزاعی و ئیسحاق و ئیبن مومبارەک و وتەیەکی پێشەوا ئەحمەدیشە.

## مەرجەکانی نوێژ ئەنجام دان

یەکەم/کاتەکەی:-وەکو خوای گەورە فەرموویەتی:

﴿ إِنَّ الصَّلَوٰةَ كَانَتْ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ كِتَٰبًا مَّوْقُوتًا ﴾ [النساء ١٠٣] واتە/ بەڕاستی نوێژ ئەنجام دان فەرزکراوە لەسەر بڕواداران، وە کاتی دیاری کراوی خۆی هەیە، کەلە کەیەوە دەست پێدەکات و لەکەیدا کۆتایی دێت.

## کاتەکانی نوێژ

أ-نوێژی بەیانی:-دەست پێدەکات لە دەرکەوتنی کازیوەی ڕاستی بەیانی(الفجر الصادق) هەتا ڕۆژ هەڵاتن.

ب-نوێژی نیوەڕۆ:-دەس پێدەکات لە کاتی لادانی ڕۆژ(خۆر) لەناوەڕاستی ئاسمان هەتا سێبەری هەموو شت وەکو خۆی لێدێت.

ج-نوێژی عەسر:-یەکەم کاتی ئەوەیە کە سێبەری هەموو شتێک هەندێ لە سێبەری خۆی زیاتر بێت، وە کۆتا کاتیشی هەتاکو خۆرئاوا بوونە.

د-نوێژی شێوان(مَغرِب):-یەکەم کاتی ئەوەیە کە خۆر ئاوا بێت، وە کۆتا کاتیشی هەتاوەکو نەمانی سووورای خۆرە، ئەگەر بەکاتیش لێکبدرێتەوە یان کات بکەینە پێوەر ئەوە کات ژمێرو چارەکێک تا کات ژمێرو نیوێک دەڕوات.

ە-نوێژی خەوتنان(عِشَاء):- یەکەم کاتی ئەوەیە کە سوورایی خۆر لەپاش خۆرئاوا بوون نەمێنێت، وە کۆتا کاتیشی هەتا وەکو نیوە شەوە، لای هەندێ لە زانایانیش هەتاکو دەرکەوتنی سپێدەیە-بەربەیان(الفجر)ە.ئەم کاتانەش کەباس کران یەکێکە لە مەرجەکانی نوێژ ئەنجام دان، هەر لەبەر ئەمەیە نوێژ ئەنجام دان پێش کاتەکەی دروست نییە، بە تێکڕای زانایان، وە زانای پایە بەرز ئیبن عوسەیمینیش فەرموویەتی:هەر کەسێ نوێژ ئەنجام بدات و تەکبیرەی ئیحرام بکات پێش کاتەکەی پاشان دوای تەکبیرەی ئیحرام یەکسەر کاتی نوێژەکە دەس پێ بکات نوێژەکەی دروست نییە، چونکە پێش کاتەکەی دەستی پێ کردووە.

## حوکمی کەسێ پێش هاتنی کاتی نوێژ، نوێژ ئەنجام بدات بە نەزانین پاشان بۆی دەربکەوێت کە کاتەکەی نەهاتووە؟

زانایان دوو بۆچوونیان هەیە لەم بوارەدا:-

١-فەرموویانە ئەگەر کەسێ نوێژی ئەنجام دابێت پێش

کاتەکەی بەنەزانین یان بە لەبیر چوونەوە، ئەوە دەبێت نوێژەکەی ئەنجام بداتەوە ئەگەر کاتەکەی مابوو، وەئەگەر کاتەکەی نەمابوو نوێژەکەی دووبارەناکاتەوە، ئەم بۆ چوونەش یەکێکە لە ووتەکانی پێشەوا مالیک.

٢-دەبێت نوێژەکەی دووبارە بکاتەوە ئەگەر کاتەکەی مابێت یان نەما بێت، لای زۆربەی زانایان وەکو ئیبن عومەرو زوهری و ئەوزاعی وپێشەوا شافعی و ئەحمەد و یەکێک لە وتەکانی پێشەوا مالیک.

## حوکمی ئەو کەسەی نوێژ ئەنجام دەدات و گومانی لە هاتنی کاتەکەی هەیە

پێشەوا عەبدول بەڕ(ڕەزای خوای لێ بێت)فەرموویەتی:- موسڵمانان تێکڕا لەسەر ئەوەن ئەگەر کەسێ نوێژ ئەنجام بدات و گومانی هەبێت، ئایا کازیوە یان سپێدەی بەیانی(الفجر الصادق) دەرکەوتووە یان نا ئەوە نوێژەکەی دروست نییەو دانامەزرێت.

## حوکمی ئەوە کەسەی نوێژ دوا دەخات و هەتاوەکو کاتەکەی نامێنێت

١-ئەگەر کەسێ نوێژ ئەنجام نەدات بە هۆی هۆکارێکەوە بێت هەتا کاتەکەی نامێنێت، ئەوە هەر کاتێک هۆکارەکەی نەما نوێژەکەی ئەنجام دەدات و نوێژەکەشی تەواوە وەکو

ئـەو کەسـە وایـە کـە لـە کاتـی خۆیـدا نوێژەکـەی ئەنجامـداوە.

ئەو هۆکارانەش وەکو ئەمانە:-

أ-لەبیرچوونـەوە، ب-خەوتـن، ج- نەزانیـن، د-زۆر لـێ کـردن واتـە بـەزۆر ڕێ لـێ بگیرێـت کـە نوێژەکـەی ئەنجـام بـدات.

٢- ئەگـەر کەسـێ نوێـژ ئەنجـام نـەدات بەبـێ هـۆکار واتـە بـە ئەنقەسـت لـە کـاتی خۆیـدا هەتـا وەکـو کاتەکـەی نامێنـێ، ئـەوە زانایـان کۆکـن لەسـەر ئـەوەی کـە تاوانبـارە و تاوانـی گـەورەی ئەنجام داوە، وە لای هەندێ لـە زانایانیش لـە بازنـەی ئیسـلام دەردەچێت بـەو کارەی، وە بێ باوەڕ دەبێت، بەڵام ڕای پەسـەند ئەوەیـە کەبـێ بـاوەڕ نابـێ بـەم کارەی کـە ڕای زۆری زانایانـە، پـاشان زانایان ڕا جیاوازیان هەیە کە دەبێ نوێژەکـەی دووبارە بکاتـەوە یان نـا؟

لای زۆربـەی زانایان دروسـتە نوێژەکـەی دووبارە بکاتەوە، وە لای هەندێ لـەزانایانـی تـر درووسـت نیـە نوێـژەکـەی دووبارە بکاتـەوە، وە ئەگـەر دووبارەشـی بکاتـەوە لـێ ی وەرنـاگیرێت، لەوانـە زانایـی پایەبـەرز ئیبـن عوسـەیمین فەرمووبەتی:ئەگـەر هـەزار جار نوێژەکـەی دووبـارە بکاتـەوە لێی وەرنـاگیرێ، ئیلا دەبێت پەشـیمان بێتـەوە لـەو کارەی و جارێکـی تـر دووبـارەی نەکاتـەوە بۆ ئـەوەی خـوای گـەورە لێی خۆش بێت.

دووەم /پاکێتی:- یەکـێ تـر لەمەرجەکانی نوێـژ دەس نوێـژە، کـە نوێـژ بەبـێ دەس نوێـژ دانامەزرێـت، وەکـو پێغەمبـەری خـودا(درووی خـوای لەسـەر بـێ) فەرموویەتـی:

(لاَيَقبَلُ اللهُ صَلاَةَ أَحَدِكُم إِذَا أَحدَثَ حَتَّى يَتَوَضَّأَ)[1]. واتـە/خوای گەورە نوێژی کەسێک وەرناگرێت کاتێ توشی بێ دەس نوێژی دەبێت هەتاکو دەس نوێژ نەگرێت.

هەروەهـا پاکێتـی لاشـەیە لەلـەش گرانی(جنابـة)، هەروەهـا پاکێتـی لاشـە و جـل و بـەرگ و شـوێنی نوێژەکـەش لەپیسـی مەرجە بۆ تەواویەتـی نوێژ، هـەر چەندە لای هەندێ لە زانایان پاکێتی لاشـەو جل و بەرگ و شـوێنی نوێژەکـە لـەپیسـی مـەرج نـییە بـۆ تەواویەتـی نوێـژ، بەڵکـو پێویستە(واجب)بـۆ ئـەنجـام دانـی نـوێـژ واتـە کـەسەکە پێـی تاوانبار دەبێ نـەک نوێژەکەی دانامەزرێـت.

سـێ یەم/داپۆشـینی عـەورەت:- یـەکێکـی تـر لـە مـەرجەکانی نوێژ، داپۆشینی عەورەتە، کە نوێژ ئەنجام دان بـەبـێ داپۆشـینـی عـەورەت دانامەزرێـت، کـە داپۆشـینی عـەورەت بـۆ پیـاوان لـە نێـوان نـاوک هەتـا وەکـو ئەژنۆیـە، وەکـو پێغەمبـەر(درودی خـوای لەسـەربێ) فـەرموویەتـی:

(مَابَينَ السُّرَّةَ وَالركبَةِ عَورَة)[2].بـەڵام بـۆ ئافرەتـان هـەمـوو لاشـەیەتی جگـە لـە ڕوومـەت و هـەردوو دەسـتی.

چـوارەم/ ڕووکردنـە ڕووگە(قیبلـە):- ڕووکردنـە قیبلـە یـەکێکی تـرە لـە مەرجەکانـی نوێـژ، چونکـە خـوای گـەورە فەرمانـی کـردووە ڕوو بکـەینـە ڕووگـە(قیبلە) هـەر وەکـو فەرموویەتـی:

(١)أخرجـه البخاري برقم (١٣٥) ومسلم (٢٢٥)
(٢)أخرَجه أبو داود برقم (٤٩٦)،وحسنه الألباني

﴿وَمِنْ حَيْثُ خَرَجْتَ فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ وَحَيْثُ مَا كُنتُمْ فَوَلُّوا وُجُوهَكُمْ شَطْرَهُ﴾ [البقرة ١٥٠] واتە/هەر کاتێ کە لەماڵ دەرچوویت و لەسەفەردا بوویت ڕوو بکەرە کەعبەی پیرۆز وە ئێوەش ئەی موسڵمان هەرکاتێک لە هەر شوێنێکدا بوون ئەوا ڕوو بکەنە کەعبەی پیرۆز.

## لەسێ کاتدا دروستە ڕوو نەکرێتە قیبلە

٣ نەخۆشی + ترس + [illegible]

أ/ ئەگەر کەسەکە نەتوانێت ڕوو بکاتە ڕووگە وەکو نەخۆشی، هەر وەکو پەروەردگار فەرموویەتی:

﴿فَاتَّقُوا اللَّهَ مَا اسْتَطَعْتُمْ وَاسْمَعُوا وَأَطِيعُوا وَأَنفِقُوا خَيْرًا لِّأَنفُسِكُمْ وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ﴾ [التغابن ١٦] واتە/خۆپارێزبن و تەقوای خوای گەورە بکەن هەرچەندێ لەتواناتاندا هەیە.

ب/ لە کاتی ترسی زۆردا وەکو کەسێک دوژمن بەدوایدا بێت یان لە کاتی جەنگدا بێت، لەم کاتانەدا دروستە نوێژ بکات بەبێ ڕووکردنە قیبلە چ بەپیادە بێت یان بەسواری بێت، وەکو خوای گەورە فەرموویەتی:

﴿فَإِنْ خِفْتُمْ فَرِجَالًا أَوْ رُكْبَانًا﴾ [البقرة ٢٣٩] ئەگەر هاتوو لەکاتی جەنگدا بوون وە ترستان لەسەر بوو دەتوانن نوێژەکان ئەنجام بدەن بەپیادە بون یاخود بەسواری، وە ڕووتان لە ڕووگە بوو یان نا، وتەی (فَإنْ خِفتُم) ووتەیەکی گشتی یە هەموو ترسێک دەگەرێتەوە.

ج/ لەکاتی نوێژی سونەتدا لە سەفەردا دروستە نوێژ ئەنجام بدرێت و ڕوو لە قیبلە نەکرێت، چ لە ناو فڕۆکەدا بێ یان بەسواری ئۆتۆمبیل بێت یاخود بەسواری ئاژەڵ بێت، لەم سێ کاتەدا دروستە نوێژ ئەنجام بدرێت، بەبێ ئەوەی ڕوو لە قیبلە بکرێت، ڕوو لە هەر شوێنێک بکرێت دروستە و ئاساییە.

تێبینی//ئەو کەسەی کە نازانێت ڕووگە(قیبلە) ڕووی لە کوێ یە یان لە چ شوێنێکەدایە، پێویستە هەوڵ بدات و بگەڕێت بۆ دۆزینەوەی قیبلە پاشان نوێژەکەی ئەنجام بدات، بەڵام ئەگەر دوای ئەنجام دانی نوێژەکەی بۆی دەرکەوت هەڵەی کردووە لە ڕوو کردنە قیبلە ئەوە پێویست نییە لەسەری نوێژەکەی بگێڕێتەوە، والله أعلم.

پێنجەم/نیەت هێنان:- نیەت هێنان یەکێکی ترە لە مەرجەکانی نوێژ، چونکە نوێژ ئەنجام دان بەبێ نیەت دانامەزرێت، هەر وەکو پێغەمبەری خودا (دروودی خوای لەسەربێ) فەرموویەتی:

(إِنَّما الأَعمَالُ بالنِّيَاتِ )[1] أخرجه البخاری ومسلم. واتە / بەدڵنیاییەوە وەرگرتنی کردەوەکان بەپێی نیازەکانە.

## گۆڕینی نیەت لە ناو نوێژدا

گۆڕینی نیەت لە ناو نوێژدا چەند شێوازێکی هەیە:-

١-گۆڕینی نیەت لە نوێژێکی فەرزەوە بۆ نوێژێکی فەرزی تر، وەکو کەسێ نوێژی عەسر ئەنجام دەدات، پاشان لە ناو

(١)أخرجه البخاري برقم (١) ومسلم (١٩٠٧).

نوێژەکەدا بیری دەکەوێتەوە کە نوێژی نیوەڕۆی نەکردووە، یەکسەر نیەتی دەگۆڕێ بۆ نوێژی نیوەڕۆ، ئەم نیەت گۆڕینە دروست نییە و هەر دوو نوێژەکەشی پێ پوچەڵ دەبێتەوە، چونکە نوێژی یەکەمی تەواو نەکردووە، وە نوێژی دووەمیشی لەسەرەتاوە دەست پێ نەکردووە.

٢-لە نوێژی فەرزەوە بۆ نوێژی سونەت بەهەمان شێوە لە نوێژی سونەتەوە بۆ نوێژی فەرز دروست نییە، وەکو کەسێ نوێژێکی فەرزی بەتەنها ئەنجام دابێت، پاشان کۆمەڵێک دەبینێ نوێژی بەکۆمەڵ ئەنجام دەدەن، یەکسەر نیەتەکەی دەگۆڕێت بۆ نوێژی سونەت بۆ ئەوەی لەگەڵ ئەواندا نوێژەکەی بە کۆمەڵ ئەنجام بدات.

٣-لە سونەتێکی دیاری کراوەوە(المقید) بۆ سونەتێکی دیاری کراوی تر، وەکو کەسێ نوێژی سەلاوی مزگەوت(التحیة المجسد) بکات پاشان نیەتی بگۆڕێت بۆ سونەتی بەیانی، کە ئەمەش بە هەمان شێوە دروست نییە، چونکە هەردوو نوێژەکە دانەمەزراوە.

٤-لە سونەتێکی ڕەها(المطلق) بۆ سونەتێکی دیاری کراو(المقید)، وەک کەسێ نوێژی سونەتی ڕەها بکات پاشان نیەتی بگۆڕێت بۆ نوێژی بەیانی کە بیری دەکەوێتەوە سونەتی بەیانی ئەنجام نەداوە، کە ئەمەش بە همان شێوە دروست نییە.

٥- لە سونەتێکی دیاری کراو(المقید) نیەت بگۆڕێ بۆ

سونەتێکی ڕەها (المطلق)، وەک کەسێ نوێژی سونەتی دەس نوێژ ئەنجام بدات، پاشان نیەتی بگۆڕێ بۆ سونەتی ڕەها، ئەم شێوازە دروستە.(واللهاعلم)

٦- لەپێش نوێژی-ئیمامەتییەوە نیەت بگۆڕێ بو مەئموومی، ئەم شێوازەش دروستە، لەبەر ڕووداوەکەی ئەبو بەکر(ڕەزای خوای لێبێ)کاتێ پێش نوێژی ئەنجام دەدا بۆ هاوەڵان لەو کاتەدا پێغەمبەری خوا(دروودی خوای لەسەربێ) هاتە مزگەوتەوە، کە ئەبو بەکر(ڕەزای خوای لێبێ)هەستی کرد پێغەمبەری خوا(دروودی خوای لەسەربێ)هاتە مزگەوتەوە، دەست بەجێ گەڕایە دواو، بەڵام پێغەمبەری خوا(دروودی خوای لەسەربێ) ئاماژەی پێدا کە لە شوێنی خۆی نەجولێت.

٧-لە مەئموومییەو بۆ پێش نوێژ(ئیمامەت)وەکو ئەوەی پێشەوا ڕووداوێکی بەسەر بێ نەتوانێت نوێژەکەی ئەنجام بدات، دروستە کەسێ بڕواتە شوێنی ئیمام و نیەتی بگۆڕێت بۆ ئیمامەت.

٨-دروستە کەسێ کە بەتەنها نوێژ ئەنجام دەدات نیەتی بگۆڕێ بۆ ئیمامەتی، وەکو ئەوەی کەسێ کە بە تەنها نوێژ ئەنجام دەدات کەسێکی تر بێت بە تەنیشتییەوە بۆستێ و شوێنی بکەوێت (ئیقتدای)پێوە بکات و بیکەنە کۆمەڵ (جماعە).

٩-گۆڕینی نیەت لە مەئموومیەتەوە بۆ تەنهایی، وەکو کەسێ ئازاری بۆ دروست ببێت نەتوانێ نوێژەکەی بە کۆمەڵ ئەنجام بدات، یان لەبەر زۆر درێژکردنەوەی نوێژەکە لەلایەن

ئیمامـەوە، لـەم کاتـەدا دروسـت مەئمـووم نیـەتی بگـۆڕێ بـۆ تەنـهای و نوێژەکەی بەتەنها ئەنجام بدات، لەبەر ڕووداوەکەی مـەعازی کوڕی جەبـەل کـە مەعـاز پێش نوێـژی دەکردو نوێژەکـەی درێـژ کـردەوە، پیاوێـک جیابـوەوە لـە جەماعـەت و نوێژەکـەی بـە تەنهـا ئەنجـام دا، پاشـان شـکایەتی هێنایـە لای پێغەمبـەری خـوا(دروودی خـوای لەسـەربێ) لەکارەکـەی مەعـاز، پێغەمبـەری خـوا(دروودی خـوای لەسـەربێ) فـەرمووی: ئـەی مەعـاز ئەتەوێت خەڵکی بـە فیتنـەدا بەیت.

## جیاوازی نێوان نیەتی ئیمام و مەئمووم

جیـاوازی نێـوان نیەتـی ئیمـام و مەئمـووم چەنـد شـێوازێکی هەیـە:-

١-لای هەمـوو زانـایان دروسـتە کەسـێ نوێژی سونەت ئەنجام بدات لـە دوای کەسێکەوە کە نوێژی فـەرز ئەنجام دەدات.

٢-ئەنجـام دانـی نوێـژی فـەرز لە دوای کە سێکەوە کە نوێژی سونـەت ئەنجـام دەدات، وەکـو ئـەوەی کەسـێ لـە ڕەمەزانـدا دێتـە مزگەوتـەوە نوێژ عیشـا ئەنجـام دراوە، ئایـا دروسـتە بۆی نوێـژی خەوتنانـی (عِشـاء)ئەنجام بـدات لـە دوای ئـیمامەوە کـە نوێژی تەراویح ئەنجام دەدات، ئەمـەش لای زانایان ڕا جیـاوازی هەیـە ئایا دروستە یان نا؟لای هەندێ زانایان دروسـت نییـە و نابێت نوێژی مەئمووم لـە نوێـژی ئـیمام بەرزتر بێت، بەڵام ڕای پەسـەند ئەوەیـە کـە دروستەلـەبـەر کارەکـەی مەعـازی کوڕی

جەبەل کە لەگەڵ پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەربێ) نوێژی خەوتنانی ئەنجام دەدا، پاشان کە دەگەڕایەوە بۆ ماڵەوە ئیمامەتی بۆ کەس و کارەکەی ئەنجام دەدا، لە کاتێکدا نوێژەکەی مەعاز سونەت بوو، بەڵام کەس وکارەکەی نوێژی خەوتنانیان ئەنجام دەدا.

٣-ئەنجام دانی نوێژی فەرز لە دوای ئیمامێکەوە کە نوێژی فەرزێکی تر ئەنجام دەدات، وەکو کەسێک کە نوێژی نیوەڕۆی ئەنجام نەداوە لە دوای ئیمامێکەوە ئەنجامی دەدات کە ئیمامەکە نوێژی عەسر ئەنجام دەدات، ئەم کارە دروستە چونکە مەرج نییە نیەتی ئیمام و مەئمووم یەک بێت.

تێبینی: //

أ-ئەگەر نوێژی مەئمووم ژمارەی ڕکاتەکانی زیاتربوو لە نوێژی ئیمامەکە، ئەوە لەم کاتەدا کە ئیمامەکە سەلامی دایەوە، مەئمووم هەڵدەستێتەوە چەند ڕکاتی مابێت ئەنجامی دەداتەوە، وەکو کەسێک کەنوێژی عەسر ئەنجام بدات لە دوای ئیمامێکەوە کە نوێژی مەغریب ئەنجام دەدات.

ب-ئەگەر نوێژی مەئمووم ژماری ڕکاتەکانی(رکعات) کەمتر بێت لە نوێژی ئیمام، وەکو کەسێک نوێژی شێوان(مغریب) ئەنجام بدات لە دوای ئیمامێکەوە کە نوێژی خەوتنان(عیشا) ئەنجام دەدات ئەم کارە لای هەندێ لە زانایان دروست نییە، چونکە جیابوونەوە لە ئیمام ڕوودەدات دەبێت مەئمووم لە

ڕکاتی سێ یەم لەگەڵ ئیمام جیابێتەوە وە تەحیات بخوێنێت و سەلام بداتەوە، بەڵام لای هەندێ لە زانایانی تری وەکو ئیبن تەیمییە و ئیبن عوسەیمین دروستە، ئەم کارە ئەنجام بدرێت ئەگەر چ جیابوونەوە لە ئیمامیش ڕوو بدات.

٤-کەسێ کەلە شوێنی خۆیەتی (موقیمە) نوێژ ئەنجام بدات لە دوای کەسێکەوە کە موسافیرە، کە نوێژی موسافیر دوو ڕکاتە لە نوێژە چوار ڕکاتیەکاندا، ئەم کارە دروستە بەڵام دەبێت مەئموم هەستێتەوە ئەو ڕکاتانەی کە ماوە ئەنجامی بدات.

٥-کەسێ کە لەسەفەردایە نوێژ ئەنجام بدات لە دوای ئیمامێکەوە کە لە شوێنی خۆیدایە، ئەم کارەش دروستە بەڵام دەبێت موسافیرەکە نوێژەکەی کورت نەکاتەوەوە بەتەواوی ئەنجامی بدات لەگەڵ ئیمامدا، لەبەر فەرمودەکەی ئیبن عومەر:

(أَنَهُ كَانَ إِذَا صَلَّى مَعَ الإِمَامِ صَلَّىَ أَربَعاً، وَإِذَا صَلاَّهَا وَحدَهُ صَلَّى رِكعَتَين)[1].

واتە/ئیبن عومەر کاتێ لەسەفەردا بووایە، ئەگەر لەگەڵ ئیمام نوێژی ئەنجام بدایەچوار ڕکاتی ئەنجام دەدا، بەڵام ئەگەر بە تەنها نوێژی ئەنجام بدایە دوو ڕکاتی ئەنجام دەدا، واتە کورتی دەکردەوە.

## پایەکانی نوێژ(أركان الصلاة)

نوێژ ئەنجام دان چەند پایەیەکی هەیە، کە بەبێ ئەو پایانە

(١)أخرَجَه مُسلم برقم (٦٩٤).

نوێژ دانامەزرێ، ئەگەربەئنقەست ئەنجام نەدرێت، بەڵام ئەگەربە نەزانین یان بەلەبیرچوونەوە ئەنجام نەدرا ئەوە تەنها ئەو رکاتە دانەمەزراوە کە پایەکەی تێدا ئەنجام نەدراوە، لای زۆربەی زانایان.

پایەکانی نوێژ دە (١٠) دانەن:-

١-پایەی یەکەم (الله أكبَر)ی دەس پێکردنی نوێژ(تَكبيرة الإحرام): (الله أكبَر)ی دەسپێکردنی نوێژ کە پێی دەوترێت(تَكبيرة الإحرام) یەکێکە لە پایەکانی نوێژ، کە نوێژ بەبێ ئەو دانامەزرێت، لای زۆربەی زانایان، بەڵام لای پێشەوا ئەبو حەنیفە(تَكبيرة الإحرام) مەرجە(شرط)ە بۆ نوێژ، چونکە لە دەرەوەی نوێژە، بەڵام ڕای پەسەند یەکێکە لە پایەکانی نوێژ وەکو زۆربەی زانایان فەرموویانە.

٢- وەستان بەپێوە(القيام):- وەستان بە پێوە لە نوێژە فەرزەکاندا بۆ کەسێ کە توانای هەبێ، یەکێکە لەپایەکانی نوێژ بەلای هەموو زانایانەوە، خوای گەورە فەرموویەتی:

﴿وَقُومُوا لِلَّهِ قَٰنِتِينَ﴾ [البقرة ٢٣٨] واتە/بەمل کەچییەوە بۆ خوای گەورە ڕاوەستن.

هەروەها لەبەر فەرموودەکەی پێغەمبەری خوا(دروودی خوای لەسەربێ) کە فەرموویەتی:(صَلِّ قَائِماً فَأن لَمْ تَستَطِع فَقَاعِداً، فَإن لَمْ تَستَطِع فَعَلَى جَنبٍ)[1].

---

(١)أخرجه البخاري برقم (١١١٧)وأبوداود (٩٥٢)والترمذي(٣٧٢)وابن ماجه (١٢٢٣)وأحمد (١٩٨١٩).

واتـە/بەپێوە نوێژ ئەنجام بدە، ئەگەر نەتوانی بە دانیشتنەوە، ئەگەر هـەر نەتوانی لەسـەر لا تەنیشت (ڕاکشان).

٣-خوێندنی سورەتی فاتیحە(قراءة الفاتحة):-

خوێندنی سورەتی فاتیحە لای زۆربەی زانایان وەکو(مالک و شافعی و ئەحمەد) پایەیەکە لە پایەکانی نوێژ، دەبێت بخوێندرێت لە هەموو ڕکاتێکدا، چ لە نوێژی فەرز بێت یان سونەت، وە لەو نوێژانەی کە دەنگی تێدا بەرز دەکرێتەوە، وە لەو نوێژانەشی کەدەنگی تێدا بەرزناکرێتەوە، لەبەر فەرموودەکەی پێغەمبەری خودا(دروودی خودای لە سەر بێ) کە فەرموویەتی:

(لَاصَلَاةَ لِمَن لَم يَقرَأ بِفَاتِحةِ الكِتَاب)[1]واتـە/ نوێژی کەسێ تەواو نییە کە سورەتی فاتیحەی نەخوێنێت، هەر چەندە لای هەندێ لەزانایان دروستە لەو نوێژانەدا نەخوێندرێ کە دەنگی تێدا بەرز دەکرێتەوەلە ڕکاتی یەکەم و دووەمدا وەکو نوێژی(بەیانی-شێوان-خەوتنان)بەڵام بە لای پێشەوا ئەبو حەنیفەوە خوێندنی سورەتی فاتیحە پایەیەک نییە لە پایەکانی نوێژ بەڵکو واجبە، وە بە هەر ئایەتێکی تریش لە قورئانی پیرۆزدا دادەمەزرێت لە جیاتی سورەتی فاتیحە وەکو:خوای گەورە فەرموویەتی:

﴿ فَاقْرَءُوا مَا تَيَسَّرَ مِنَ الْقُرْءَانِ﴾ [المزمل ٢٠] واتـە/جا چەنتان بۆ گونجا ئەوندە قورئان بخوێنن وشەو نوێژ بکەن، بەڵام ڕای پەسەند ئەوەیە کە خوێندنی سورەتی فاتیحە یەکێکە لە پایەکانی نوێژ، وەکو زۆربەی زانایان فەرموویانە.

(١)أخرجه البخاري برقم (٧٥٦) ومسلم (٣٩٤)وغيرهما.

٤-ڕکوع بـردن(الركوع):-زانایان کۆکن لەسـەر ئـەوەی کەڕکوع بردن یەکێکە لە پایەکانی نوێژ، لەبەر فەرموودەکـەی پێغەمبەری خودا (درووودی خـودای لە سەر بێت) کـە فـەرموویـەتی:

(ثمَّ اركَع حَتَّى تَطمَئِنَّ رَاكِعًا)[1] پێغـەمبـەری خـودا(درووودی خـوای لەسـەربـێ) بـەو پیـاوەی فەرمووکـە نوێژەکـەی بـە جوانـی ئەنجام نـەدا، پاشـان ڕکـوع بـەرە ئەونـدەش بمێنـەرەوە لەڕکوع هەتـا لاشـەت ئـارام دەبێتـەوە، واتـە لەجوڵـە دەکەوێـت.

٥- هەستانەوە لە ڕکوع (الاعتدال من الركوع):-

هـەستـانەوە لـە ڕکـوع یەکێکـی تـرە لەپایەکانـی نوێـژ، لەبـەر فەرموودەکەی پێغەمبەری خـودا(درووودی خـودای لـە سـەر بێ) کـە فـەرمووی بە پیاوەکە:

(ثمَّ ارفَع حَتَّى تعتَدِل قَائِماً).[2]واتـە/پاشـان سـەر بـەرزبکەرەوە لەرکـوع هەتـا ڕێـک دەبیتـەوە بـە پێـوە.

٦- کڕنـوش بردن(السـجـود):- زانایـان لـەسەر ئـەوە یـەک دەنگـن کـە

کڕنـووش بـردن یەکێکـە لەپایەکانـی نوێـژ، هـەر وەکـو خـوای گـەورە فەرموویەتـی :

﴿ارْكَعُـوا وَاسْـجُدُوا﴾ [الحج ٧٧] واتـە/ئـەی ئـەوانـەی کەبـاوەڕتان هێـناوە ڕکـوع بـەرن و کـڕنووش بـەرن، هـەروەها لـەبەر

(١)أخرجة البخاري برقم (٦٢٥١)ومسلم (٣٩٧).
(٢)أخرجة البخاري برقم (٦٢٥١)ومسلم (٣٩٧).

فەرموودەکەی پێغەمبەری خودا (دروودی خودای لە سەر بێ) کە فەرموویەتی : (ثُمَّ اسجُد حَتَّى تَطمَئِنَّ سَاجِداً).[1]

واتە/ پاشان کڕنووش بەرە هەتا دڵنیا دەبی کە کڕنووشت بردووە.هەروەها کڕنووش بردن دەبێ لەسەر حەوت ئەندام ببرێت، وەکو لە ئیبن عەباسەوە هاتووە کە فەرموویەتی:فەرمانم پێکراوە کەلەسەرحەوت ئەندام کڕنووش بەرم، لەسەر نێوچاوان و لووت، کە بەدەست ئاماژەی کرد بۆ لووتی، وە لەسەر هەردوو دەست و هەردوو ئەژنۆ و وەسنگی هەردوو پێیان، (عن ابن عباس مرفوعاً) (أُمِرتُ أَن أَسجُدَ عَلَى سَبعَةِ أَعظُم:عَلَى الجبهَةِ وَأَشَارَ بِيَدِهِ إِلَى أَنفِهِ-وَاليَدَينِ، وَالرُّكبَتَينِ، وَأَطرَافِ القَدَمَينِ)[2].

٧- دانیشتن لە نێوان هەردوو کڕنووشەکاندا (الجلوس بين السجدين):-

پێغەمبەری خودا (دروودی خودای لە سەر بێ)کە فەرموویەتی:

(ثُمَّ ارفَع حَتَّى تَطمَئِنَّ جَالِساً).[3] واتە/ پاشان سەرت بەرز بکەرەوە لە کڕنووش برن هەتا وەکو دڵنیا دەبیت کەدانیشتوویت.

٨-دانیشتن بۆ تەحیاتی کۆتایی و وە خوێندنی تەحیاتی کۆتایی (الجلوس للتشهد الأخير والتشهد الأخير):

فوقەهایان کۆکن لەسەر ئەوەی کە دانیشتنی کۆتایی یەکێکە لە پایەکانی نوێژ، بەڵام جیاوازیان هەیە لەسەرخوێندنی

(١)أخرجه البخاری برقم (٦٢٥١) ومسلم (٣٩٧).
(٢)أخرجه مسلم برقم (٤٩٠).
(٣)أخرجه البخاری برقم (٦٢٥١) ومسلم (٣٩٧).

تەحیاتی کۆتایی کە ئایا پایەیەکە لەپایەکانی نوێژ یان نا، لای شافعییەکان و حەنابیلەکان خوێندنی تەحیاتی کۆتایی یەکێکە لە پایەکانی نوێژ، بەڵام لای مالکییەکان سونەتە، وە ڕای پەسەندیش ڕای شافعی و حەنابیلەکانە کە یەکێکە لە پایەکانی نوێژ، واللە أعلم

٩-ئارامی و دڵنیایی(الطمأنینة):-

ئارامی و لەسەرخۆی لە نوێژدا یەکێکە لەپایەکانی نوێژ، چونکە پێغەمبەری خودا(دروودی خوای لەسەر بێ) لە هەموو پایەکاندا فەرموویەتی:(حَتَّى تَطمَئِنَّ)

واتە/هەتا ئارام دەبیتەوەوە لە جوڵە دەکەویت.

١٠- پایەی دەیەم/سڵاودانەوەیە(السلام):-

سڵاودانەوە یەکێکی ترە لە پایەکانی نوێژ، لەبەر فەرموودەکەی عائیشە (ڕەزای خوای لێبێت) کەفەرموویەتی:

(كَانَ رَسُولُ اللهِ يَختِمَ الصَّلاة بِالتَّسلِم)[1] واتە/پێغەمبەری خودا(دروودی خودای لە سەر بێ) کۆتای بە نوێژەکەی دەهێنا بەسڵاودانەوە.

تێبینی// تەنها سڵاو دانەوەی یەکەم فەرزەو یەکێکە لە پایەکانی نوێژ لای زۆربەی زانایان، واللە أعلم.

(١)أخرجه مسلم برقم (٤٩٨) وأبوداود (٧٨٣).

## پوچەڵ کەرەوەکانی نوێژ (مبطلات الصلاە)

بەئەنجام دانی یەکێک لەم کردەوانەی خوارەوە نوێژ پوچەڵ دبێتەوە:-

١-ئەنجام نەدانی مەرجێک لە مەرجەکانی نوێژ یان پایەیەک لە پایەکانی نوێژ، بەئەنقەست نوێژ پوچەڵ دەکاتەوە، هەر وەکو ئیبن ڕوشد فەرموویەتی زانایان کۆکن لەسەر ئەوەی کە کەسێک بەبێ دەس نوێژ، نوێژ ئەنجام بدات پێویستە لەسەری نوێژەکەی دووبارە بکاتەوە، یان (رکوع) نەبات یان کڕنووش نەبات بەئەنقەست، پێویستە نوێژەکەی دووبارە بکاتەوە، بەڵام ئەگەر بە لەبیرچوونەوە یان بە نەزانین پایەیەکی ئەنجام نەدا ئەوە تەنها ئەو ڕکاتەی دانەمەزراوە، لای زۆربەی زانایان.

٢-پێکەنین ئەگەر دەنگ دەربکات نوێژ پوچەڵ دەکاتەوە، بەتێکڕایی زانایان وەکو ئیبن مونزیر گێڕایەتییەوە، بەڵام زەردەخەنە نوێژ پوچەڵ ناکاتەوە، واللە اعلم.

٣-خواردن و خواردنەوە بەقەستی نوێژ پوچەڵ دەکاتەوە، وەکو ئیبن مونزیر فەرموویەتی زانایان کۆکن لەسەر ئەوەی کەسێ خواردن یان خواردنەوەی خوارد لەنوێژی فەرزدا بەقەستی، ئەوە دەبێ نوێژەکەی دووبارە بکاتەوە، بە هەمان شێوە بۆ نوێژی سونەتیش هەمان شتە لای زۆربەی زانایان، چونکە ئەوەی نوێژی فەرز پوچەڵ بکاتەوە نوێژی سونەتیش پوچەڵ دەکاتەوە، بەڵام ئەگەر بەنەزانین یان بە لەبیرچوونەوە ئەم کارە ئەنجام درا، ئەوە نوێژپوچوڵ ناکاتەوە،

وەکو شافعیەکان وحەنابیلەکان فەرموویانە.

٤-قسەکردن بەقەستی نوێژ پوچەڵ دەکاتەوەوەکو لە زەیدی کوڕی ئەرقەمەوە هاتووە، کە فەرموویەتی:

(كُنا نَتَكَلَم فِي الصَّلَاةِ، يُكَلِمُ الرَّجُل مِنَّا صَاحِبَهُ وَهُو إلى جَنبه فِي الصَّلَاةِ حتَّى نَزَلَت): ﴿وَقُومُوا لِلَّهِ قَٰنِتِينَ﴾ [البقرة ٢٣٨] فَأَمَرَنَا بِالسُّكُوتِ و (نُهينَا عَن الكَلَامِ).[1]

واتە/ئێمە لە نوێژدا قسەمان دەکرد، هەر پیاوێک کە لە گەڵ برایەکیدا کە لە تەنیشتییەوە بوو قسەی دەکرد، هەتاوەکو ئایەتی (بەملکەچییەوە نوێژ ئەنجام بدەن) دابەزی یان هاتە خوارەوە، دوای ئەوە فەرمانمان پێکرا بێدەنگ بین و قسە لە گەڵ یەکتری نەکەین، بەڵام ئەگەر بەنەزانین یان بەلە بیرچوونە قسەکرا، نوێژ پوچەڵ ناکاتەوە، هەر چەندە حەنەفییەکان جیاوازی ناکەن لە نێوان قسەکردنی بە ئەنقەست و لە بیرچوونەوەو نەزانین بە حوکمەکەی، فەرموویانە هەمووی نوێژ پوچەڵ دەکاتەوە.

٥-ئەنجام دانی کاری زۆر نوێژ پوچەڵ دەکاتەوە، کارێک کەوا بزانرێ کەسەکە لە نوێژدانییە، بەڵام ئەگەر کارەکە کەم بوو وەک هەڵگرتنی منداڵ یان کوشتنی مارو دووپشک یان کردنەوەی دەرگا، ئەگەر دەرگاکە لە پێشی نوێژ خوێنەکەوە بوو، ئەمانە نوێژ پوچەڵ ناکەنەوە، چونکە هەمووی بەڵگەی شەرعی لەسەرە،

(١)أخرجه البخاري برقم (٤٥٣٤) و مسلم (٥٣٩).

تێبینی: گریان لە نوێژدا لای شافعییەکان نوێژ پوچەڵ دەکاتەوە، چ گریانەکە لەترسی خوای گەورە بێ یان نا، بەڵام لای حەنابیلەکان ئەگەر لە ترسی خوای گەورە بێت نوێژ پوچەڵ ناکاتەوە، بەڵام باوەڕدار دەبێت دەنگی بەرز نەکاتەوە، وەسوور بێت لەسەر ئەوەی کەس گوێی لێی نەبێت بۆ ئەوەی توشی ڕووپامای(ڕیا) نەبێت، کە شەیتان کەمندە کێشی دەکات (ڕایدەکێشێت بۆی).

## نوێژی بە کۆمەڵ (الصلاة الجماعة)

نوێژی بە کۆمەڵ خێرو پاداشتی زۆری تێدایە وەکو پێغەمبەر(دروودی خودای لەسەر بێ)فەرموویەتی:

(صَلاَةُ الجَمَاعَةِ أفضَل مِن صَلاةِ الفَذِّ بَسَبعٍ وعِشرِينَ دَرَجَةً)[1]، واتە/نوێژی بە کۆمەڵ چاکترە لە نوێژی بە تەنها بەبیست و حەوت پلە.

## حوکمی نوێژی بەکۆمەڵ بۆ پیاوان

زانایان چەند بۆچونێکیان هەیە لەم بارەیەوە:-

١-فەرزە لەسەر هەموو موسڵمانێک نوێژەکانی بە کۆمەڵ ئەنجام بدات(فرض العین)، کە ئەمش بۆچوونی پێشەوا ئەوزاعی و ئەحمەد و هەندێ لە شافعییەکانەوەکو خوای گەورە فەرموویەتی

(١)أخرجه البخاري برقم (٦٤٥) ومسلم (٦٥٠).

﴿ وَارْكَعُوا مَعَ الرَّاكِعِينَ﴾ [البقرة ﴿٤٣﴾] **واتە/**ڕکوع بەرن لە گەڵ ڕکوع بەراندا، بەڵام لای پێشەوا ئیبن تەیمییە نوێژی بەکۆمەڵ مەرجی تەواویتی نوێژە، واتە نوێژ بەبێ کۆمەڵ دانامەزرێ، بەڵام ئەم بۆچوونەبۆ چوونێکی ناپەسەندە، چونکە نوێژی بە کۆمەڵ مەرجی نوێژنییە.

٢- نوێژی بەکۆمەڵ فەرزی کیفایەیە(فرض الكفاية)واتە/ئەگەر کۆمەڵێک کەس ئەنجامی بدات ئەوە لەسەر ئەوانی تر لادەچێت، کە ئەمەش بۆچوونی زۆرێک لە شافعییەکان و مالکییەکان و حەنەفیکانیشە.

٣-نوێژی بە کۆمەڵ سونەتییەکی دڵنیاکەرەوەیە(موئەکەدەیە) و تاوان بار نابیت بەئەنجام نەدانی، لای زۆربەی زانایان وەکو(شافعی و مالیک و ئەبو حەنیفە)، لەبەر فەرموودەکەی پێغەمبەری خودا(دروودی خوای لەسەر بێ) کە فەرموویەتی:

(صَلاَةَ الجَمَاعَةِتَفضُلُ صَلاَةَ الفَذِّ بِخَمسٍ وَعِشرِينَ دَرَجَة )[1]، **واتە/**نوێژی بە کۆمەڵ فەزڵ و پاداشتی زیاترە لە نوێژی تاک، بە بیست وپێنج پلە.

کاتێک فەرموودەکە باسی پاداشتی زیاتر دەکات، کەواتە نوێژی بە کۆمەڵ فەرز نییە.

(١)أخرجه البخاري برقم (٦٤٦).

## نوێژی بە کۆمەڵ بەچەند کەس دادەمەزرێت

ئیبن قودامە فەرموویەتی:نوێژی بەکۆمەڵ بە دوو کەس بەسەرەوە دادەمەزرێ، وە نابینم کە ڕاجیاوازی زانایانی لەسەر بێت.

هەروەها پێشەوا نەوەوی فەرموویەتی:هاوەڵانمان فەرموویانە کە کەمترین نوێژی بە کۆمەڵ دوو کەسە -ئیمام و مەئموم.

## دووبارکردنەوەی نوێژی بەکۆمەڵ بۆ ئەو کەسانەی کە نەگەیشتون بە نوێژی بەکۆمەڵدا

زانایان ڕا جیاوازیان هەیە لەم بوارەدا بۆ دوو بۆچوون:-

١- دووبارکردنەوەی نوێژی بەکۆمەڵ بۆ ئەو کەسانەی کە نەگەیشتون بە نوێژی بەکۆمەڵی ئیمامدا، دروستە لای هەندێ لە زانایان، هەرچەندە ئەو مزگەوتە ئیمامی تایبەتیشی هەبێت، لەبەر فەرموودەکەی ئەبی سەعیدی خودری(ڕزای خوای لێبێت)کە فەرموویەتی:

(جَاءَ رَجُلٌ، وَقَد صَلَّى النَّبِيُّ ( ﷺ ) فَقَالَ: (أَلاَ رَجُلٌ يَتَصَدَّقُ عَلَى هَذَا فَيصَلِّى معَهُ) [1]واتە/ پیاوێک هات، لە کاتێکدا پێغەمبەری خودا(دروودی خوای لەسەر بێ)نوێژی ئەنجام دابوو، پێغەمبەری خودا(دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی:پیاوێک نییە خێرێ بەم پیاوە بکات و نوێژی لە گەڵدا بکات.بەڵکولای ئیبن عوسەیمین واجبە نوێژەکەی بەکۆمەڵ ئەنجام بداتەوە ئەگەر نەگەیشت بە نوێژی

(١)أخرَجه أبو داود برقم (٥٧٤) والترمذى (٢٢٠) و غيرهما.

بەکۆمەڵی ئیمامی تایبەتی مزگەوتدا، فەرموویەتی: چونکە نوێژی بەکۆمەڵ واجبە، وە ئەو واجبیەتییە لەسەری لاناچێت بە نەگەیشتنی بە نوێژی بەکۆمەڵی ئیمامدا، بەڵام لای هەندێ لە زانایان دووبارکردنەوەی نوێژی بە کۆمەڵ سونەتە.

٢-دووبارەکردنەوەی نوێژی بەکۆمەڵ بۆ ئەو کەسانەی کە نەگەیشتوون بە نوێژی بە کۆمەڵی ئیمامی تایبەتی مزگەوتدا، مەکروهە، وە باشترە نوێژەکەی بەتاک ئەنجام بدات لای زۆربەی زانایان، چونکە سەر دەکێشێ بۆ جیاوازی نێوان موسڵمانان، وە سەردەکێشێ بۆ کەم تەرخەمی لە نوێژی بە کۆمەڵدا، بەڵام ڕای پەسەند ئەوەیە کە دروستە دووبارکردنەوەی نوێژیبەکۆمەڵ بۆ ئەو کەسانەی کە نەگەیشتوون بە نوێژی بە کۆمەڵی ئیمامی مزگەوتدا، والله اعلم.

تێبینی: ئەو مزگەوتانەی کە لەسەر ڕێگەی خەڵکیدان دروستە بەبێ جیاوازی لە نێوان زانایاندا، دووبارکردنەوەی نوێژی بەکۆمەڵ تێیدا، چونکە ئیمامی تایبەتی نییە.

## حوکمی دەرچوونی ئافرەت بۆ نوێژی بە کۆمەڵ لە مزگەوتدا

زانایان ڕا جیاوازیان هەیە لەم بابەتەدا بۆ سێ بۆچوون:

١-دروستە بۆ هەموو ئافرەتان دەرچن بۆ نوێژی بە کۆمەڵ، ئەگەر ترسی فیتنەیان نەبێت یان توشی کیشە نەبن، ئەمەش بۆچوونی پێشەوا مالیک و هەندێ لە حەنبەلییەکانە.

٢-بە هەموو شێوەیەک بە باش نازانرێ دەرچوونی ئافرەتان بۆ نوێژی بەکۆمەڵ بە ڕای پێشەوا ئەحمەد، وە پێشەوا ئەبو حەنیفەش فەرموویەتی:

نابێت دەرچن بۆ نوێژی بەکۆمەڵ مەگەر(ئیلا) بۆ نوێژی هەردوو جەژنەکە نەبێت.

٣-دروستە بۆ ئافرەتانی پیرو بەساڵاچوو بچن بۆ نوێژی بە کۆمەڵ، نەک ئافرەتی گەنج، ئەمەش ڕای زۆربەی زانایانە، ڕای پەسەند: دروستە ئافرەتان بچن بۆ نوێژی بە کۆمەڵ، بەمەرجێ مەبەستیان ڕەزامەندی خوای گەورە بێ و پارێزراوبن لە فیتەن، وە دەرنەچن بە خۆ ڕازندنەوەو بۆن لە خۆدان، وە پیاوانیش نابێت ڕێگریان لێ بکەن، هەرچەندە ماڵەوە باشترە بۆیان، وەکو لەئیبن عومەرەوە هاتووە، کە پێغەمبەری خوا(دروودی خوای لەسەر بێ)فەرموویەتی: (لاَتَمْنَعوا نِسَاءَكُم المَسَاجِدَ، وَبُيُوتُهُنَّ خَيرٌ لَهُنَّ).[١]

## گەیشتن بە نوێژی کۆمەڵدا(إدراك الجماعة)

زانایان ڕا جیاوازیان هەیە لەسەر ئەوەی ئایا بەچی پاداشتی نوێژی بە کۆمەڵت دەس دە کەوێت:-

١-لای حەنەفییەکان و حەنابیلەکان و بۆچوونی تەواو لای شافعییەکان ئەوەیە، کەپاداشتی نوێژی بە کۆمەڵ دەس دەکەوێ بەگەیشتن بە بەشێک لە نوێژی کۆمەڵدا، ئەگەر تەحیاتی کۆتایش بێت.

(١)صحيح,أخرجهُ أحمد برقم (٥٤٦٨)و أبو داود (٥٦٧) وغيرهما.

٢-لای مـالکیـیـەکان و ووتەیەک لای شا فعییەکان و ووتەیەکی پێشـەوا ئـەحـمـەد ئەوەیە کەپاداشـتی نـوێژی بە کۆمەڵت دەس ناکەوێت مەگـەر بەگـەیشـتن بـە ڕکاتێکی تـەواودا، لەبـەر فـەرموودەکەی پێغەمبـەری خـودا (درووودی خـوای لەسـەر بێ) کـە فەرمویەتـی:

(مَن أَدرَكَ رِكعَةً مِنَ الصَّلاَةِ، فقَد أدرَكَ الصَّلاَة).[1]واتـە/ هـەرکـەسـێ بـگات بەڕکاتێک لـە نوێژ، ئەوە بەڕاستی گەیشتووە بە نوێژدا، وە هەروەهـا ئـەم بۆچوونـە، بۆچوونـی ئیبـن تەیمیـە و ئیبـن عوسـەیمین و بـن بـازو لیژنـە دائیمەشـە.

## گەیشتن بەرکات دا(إدراك الركعة)

بەهەمـان شـێوە زانایان لـە بابەتەشدا دوو بۆچوونی جیاوازیان هەیە:

١-لای زۆربـەی زانایـان ئەگـەر مەئموم بگاتـە ڕکوعـی ئیمامدا، ئـەوە گەیشـتووە بـەو ڕکاتـەدا لەبـەر فەرموودەکـەی پێغەمبـەری خـودا(درووودی خـوای لەسـەر بێ)

کـە فـەرموویـەتی:

(مَن أَدرَكَ رِكعَةً مِنَ الصَّلاَةِ، فقَد أَدرَكَ الصَّلاَة).[2]ووشـەی (ركـعة) بـەڕکوع ڕاڤـەی دەکـەن (تـەفسیر دەکـەن).

(١)أخرجه البخاري برقم (٥٨٠) ومسلم (٦٠٧).

(٢)أخرجه البخاري برقم (٥٨٠) ومسلم (٦٠٧).

٢-لای هەندێ زانایانی تر وەکو ئیبن حەزم و بوخاری و شەوکانی، ئەوەیە گەیشتن بەڕکوعی ئیمام بە ڕکات ناژمێردرێ، چونکە مەئموم سورەتی فاتیحەی نەخوێندووە، وەهەمان فەرمووده دەکەنە بەڵگە کە ووشەی (رکعە) بەڕکاتی تەواو شی دەکەنەوە(تەفسیر دەکەن).

## پێشکەوتنی ئیمام (مُسابقةُ الإمام)

شوین کەوتنی ئیمام واجبە، وەپێشکەوتنی قەدەغەیە-حەرامە، لەبەر فەرموودەکەی پێغەمبەری خودا (دروودی خوای لەسەر بێ) کە فەرمویەتی:

(إنَّمَا جُعِلَ الإِمَامُ لِيُؤْتَمَّ بِهِ).[1] واتە/ئیمام بۆ ئەوە دانراوە شوێنی بکەون.

بەڵام زانایان جیاوازیان هەیە ئایا پێشکەوتنی ئیمام بە قەستی نوێژ پوچەڵ دەکاتەوە یان نا.

زانایان لەم بابەتەدا دوو بۆچوونی جیاوازیان هەیە:-

١-لای زۆربەی زانایان نوێژ پوچەڵ ناکاتەوە، وە نوێژەکەی دروستە، بەڵام تاوانبار دەبێت.

٢-پێشکەوتنی ئیمام بە قەستی نوێژ بەتاڵ دەکاتەوە، لای هەندێ لە حەنابیلەکان وئەهلی ڕووکەش(ظاهریە کان)، وە لە ئیبن عومەریشەوە ڕیوایەت کراوە، هەروەها ڕای ئیبن

(١)أخرجه البخاري برقم (٦٨٨) والمسلم (٤١٢).

عوسەیمین و عبد الله بەسامیشە، لەسەر ئەو یاسا ئوسوڵییەی کە ووتراوە (النهي يَقتضي الفسَاد)

واتە/نەهی کردن لە کارێک پوچەڵ کردنەوەی کارەکە دەخوازێت.

ڕای پەسەند: پێش کەوتنی ئیمام نوێژ پوچەڵ ناکاتەوە، چونکە شوێن کەوتنی ئیمام ئەرکە- واجبە، واجبیش ئەگەر ئەنجام نەدرێت کارەکە پوچەڵ ناکاتەوە کە پێشتریش باسمان کرد، والله أعلم.

تێبینی:-

١- ئەو کەسەی پێش ئیمام دەکەوێت پێویستە بگەڕێتەوە شوێنی خۆی و شوێن ئیمام بکەوێت.

٢-پێش کەوتنی ئیمام لە(الله اکبر)ی ئیحرامدا واتە(اللهأكبر)ی دەس پێ کردنی نوێژ، نوێژ بەتاڵ دەکاتەوە، دەبێت دووبارەی بکاتەوە لە دوای ئەوەی ئیمام ئەنجامی دا.

* هەروەها سەلام دانەوەش پێش ئیمام، نوێژ پوچەڵ دەکاتەوە هەر وەکو ئیمام نەوەوی فەرموویەتی.

بەڵام ئەگەر بە لەبیرچوونەوە سەلامی دایەوە، نوێژ پوچەڵ ناکاتەوە، بەڵام دەبێت دوای سەلام دانەوەی ئیمام دووبارە سەلام بداتەوە، والله أعلم.

## دواکەوتن لە ئیمام

دواکەوتن لە ئیمام چەند شێوازێکی هەیە:-

١-دواکەوتن لە ئیمام بە ئەنجام نەدانی پایەیەک(رکن) یێک بەبێ هۆکار لای هەندێ لە زانایان نوێژ پوچەڵ دەکاتەوە، وەکو ئەوەی ئیمام ڕکوع ببات و کەسێ خۆی دوابخات و هەتا وەکو ئیمام هەڵ دەستێتەوە لە ڕکوع، بەڵام لای هەندێ لە زانایانی تر نوێژ پوچەڵ ناکاتەوە، بەڵکو دەبێت ڕکوعەکەی ببات و فریایی ئیمام بکەوێت.

٢-دواکەوتن لە ئیمام بە ئەنجام نەدانی دوو پایە(رکن)لای شافعییەکان و حەنابیلەکان نوێژ پوچەڵ دەکاتەوە.

٣- دواکەوتن لە ئیمام ئەگەر لە هەمان پایەدا فریایی بکەوێت، وەکو کەسێک هەندێ لە سورەتی فاتیحەی ماوە تەواوی دەکات و فریایی ڕکوعی ئیمام بکەوێت، لەم کاتەدا نوێژەکەی تەواوە، بەڵام باشتر وایە شوێنی ئیمام بکەوێت لە هەموو پایەکاندا، چونکە پێغەمبەری خودا (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرموویەتی:

(إِ ذَا رَكَعَ فَارْكَعوا) واتە/ئەگەر ئیمام ڕکوعی برد ئێوەش ڕکوع بەرن.

## ئەو هۆکارانەی(عذر) کە دروستە نوێژی بە کۆمەڵ ئەنجام نەدرێت

هۆکارەکان دەبن بە دوو بەشەوە:

یەکەم /هۆکار گشتییەکان:- وەکو: باران بارینی زۆرو توند-بای زۆر توند-سەرمایی زۆر-تاریکی زۆر-قوڕو لیتاوی زۆر-بەفر بارینی زۆر، بەڵگەش بۆ ئەمانە:خوای گەورە فەرموویەتی:

﴿ لَا يُكَلِّفُ اللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا ﴾[البقرة ٢٨٦]

واتە/خوای گەورە ئەرک ناخاتە سەر شانی هیچ کەسێک تەنها بە گوێرەی توانای خۆی نەبێ، وە هەروەها فەرموودەکەی پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەربێ)کەلەکاتی بارانی زۆرو سەرمادا دەیفەرموو

(أَلاَ صَلُّوا فِي رِحَالِكُم).[1] واتە/ئاگاداربن نوێژەکانتان لەماڵەوە بکەن.

هەروەها(إبن بطال)یش فەرموویەتی: زانایان کۆکن لەسەر ئەوەی کە نەهاتن بۆ نوێژی کۆمەڵ لە کاتی بارانی زۆرو توند و شەوی تاریک و باو سەرمای توند و هاو شێوەی ئەمانە کارێکی موباحە و ڕێگەی پێدراوە.

دووەم/ هۆکارە تابەتییەکان:- وەکو:

(نەخۆشی-ترس-چ ترس لە خۆت یان ماڵ یان منداڵ و کەس و کار بێت-ئامادە بوونی خواردن-تەنگاو بوون-خواردنی سیرو پیازو کەوەر)، ئەمانە هەموو هۆکارن بۆ نەهاتن بۆ نوێژی بە کۆمەڵ، وە هەر خاڵەو بەڵگەی تایبەتی

(١)أخرجه البخاري برقم (٦٦٦) ومسلم (٦٩٧).

خۆی لەسەرە لە فەرمودە تەواو دروستەکاندا.

## کۆکردنەوەی دوو نوێژ (الجمع بين الصَّلاتَين)

کۆکردنەوەی نێوان دوو نوێژ ئەوەیە کەنوێژی نیوەڕۆ و عەسر یان مەغریب و عیشا لەیەک کاتدا ئەنجام بدرێت، چ کۆکردنەوەی پێش خستن بێت(تقديم) وەکو ئەوەی عەسر بێنی بۆ لای نیوەڕۆ، یان کۆکردنەوەی دواخستن بێت (تأخير) وەکو ئەوەی نیوەڕۆ بیبەیت بۆ لای عەسر، بەهەمان شێوە مەغریب و عیشاش هەروایە.

*کۆکردنەوەی نوێژەکان چ لەسەفەردا بێ یان لە ئامادەبوون(مقيم)دا بێت دروستە لای زۆری زانایان، بەهەر هۆکارێک بێت هۆکاری سەفەربێت یان باران بارین یان نەخۆشی یان بۆ پێویستی بێت، بە مەرجێک نەکرێتە نەریت (عادەت)، هەر وەکو زانایی یەمەنی(مقبل وادعی) فەرموویەتی:دروستە کۆکردنەوەی نێوان دوو نوێژ لەتەمندا جارێک یان دووجار یان سێ و چوارجار، بەڵام بەردەوام ئەنجام بدرێ نەخێر، وە فەرموویەتی کۆکردنەوەی دوو نوێژ دروستە لەو کاتانەی کەمرۆڤ پێویستی پێیەتی، بەڵام بکرێتە نەریت-عادەت و دینداری ئەمە جێگر نەبووە، وە فەرموویەتی کۆکردنەوەی دوو نوێژ دروستە لە کاتی باران باریندا، ئەمیش بە هەمان شێوە نەکرێتە عادەت، چونکە باران بارین حوکمی تایبەتی خۆی هەیە، ئەویش ئەوەیە کە بانگ دەر لە جیاتی ئەوەی بڵێت (حَيَّ عَلَى الصَّلاة) بڵێت (صَلوُا فِي رِحَالِكُم) (صَلوُا فِي رِحَالِكُم)

واتە/نوێژەکانتان لە ماڵەوە بکەن، نوێژەکانتان لە ماڵەوە بکەن، هەر وەکو لە فەرموودەکاندا هاتووە، لەگەڵ ئەمانەشدا زۆربەی زانایان پێیان وایە نوێژەکان لە کاتی خۆیدا ئەنجام بدرێت باشترە، لە کۆکردنەوە لە نێوانیاندا، مەگەر کۆکردنەوەی ڕۆژی عەرەفەوە موزدەلیفە نەبێت لە کاتی حەجدا کە باشترە کۆبکرێتەوە، بەڵام کورت کردنەوەی نوێژەکان(قصر الصلاة) لەکاتی سەفەردا ئەنجام دانی باشترە لە ئەنجام نەدانی، هەر چەندە لای هەندێ لەزانایان واجبە کورت کردنەوەی نوێژ لەکاتی سەفەردا، والله أعلم.

## ئەوانەی درەنگ دێن بۆ نوێژی بە کۆمەڵ لە کاتێکدا ئیمام نوێژ کۆدەکاتەوە لە نێوان یەکتریدا (أحكام المسبوق عند الجمع)

ئەگەر کەسێک درنگ هات بۆ نوێژی بە کۆمەڵ، وە لە ناوەراستی نوێژی یەکەمدا گەیشت بە ئیمامدا ئەوە دروستە نوێژەکانی کۆبکاتەوە لە دوای تەواو کردنی نوێژی یەکەمی، بەبەڵگەی فەرموودەکەی پێغەمبەری خودا(دروودی خوای لەسەر بێ) کە فەرموویەتی:

(مَا أَدرَكتُم فَصَلُّوا، وَمَا فَاتَكُم فأَتِمُّوا).[1] واتە/ئەوەی گەیشتن پێیدا نوێژەکەتان ئەنجام بدەن، ئەوەی لە دەستان چوو تەواوی بکەن، بەڵام ئەگەر نەگەیشتن بە نوێژی یەکەمدا لەکاتی کۆکردنەوەی نوێژەکەدا، ئەوە دروست نییە نوێژەکانی کۆ

(١)أخرجه البخاري برقم (٦٣٦).

بکاتـەوە، وەکـو ئـەم شـێوازانەی کـە باسـیان دەکەیـن:-

١-ئەگـەر گەیشـت بـە بەشـێک لـە نوێـژی نیوەڕۆ لـە کاتـی کۆکردنـەوەی نوێژەکـان، ئـەوە دەتوانێـت نوێژەکـەی نیـوەڕۆی تـەواو بـکات لـە دوای سـەلام دانـەوەی ئیمـام، پاشـان بگاتـە نوێژی عەسری ئیمام و ئەویش بە هەمـان شـێوە تـەواو بـکات لـە دوای سـەلام دانـەوەی ئیمـام، بەهەمـان شـێوە بۆ مـەغریب و عیشـاش هەروایـە.

٢-ئەگـەر کاتی گەیشت، ئیمـام نوێژی نیوەڕۆی تـەواو کردبوو، ئـەوە دروست نییە نوێژەکانی کۆبکاتـەوە، بـەڵام دروسـتـە بـۆی بە نیەتی نیوەڕوو لەگەڵ ئیمـام نوێژەکەی بە کۆمـەڵ ئەنجام بدات، لـە کاتێکدا ئیمـام نوێـژی عەسـر ئەنجـام دەدات، وەکـو پێـشتر باسـمان کـردووە کـە جیـاوازی نێـوان نیەتـی ئیمـام و مەئمـوم کار لـە نوێژەکەیـان نـاکات.

٣-ئەگـەر کەسـێ کاتێک گەیشت ئیمام نوێژی مەغریبی تەواو کردبووە، لـە کـاتی کۆکردنەوەی نێوان نوێژی مەغریب و عیشـا، دەتـوانێ لـەم کاتـەدا بـە نیەتـی نوێـژی مەغریـب لـە گـەڵ ئیمـام نوێژەکـەی ئەنجام بدات لە کاتێکدا ئـیمام نوێـژی عیشـا ئەنجام دەدات، کاتێـک ئیمـام هەڵدەسـتێتەوە بۆ ڕکاتـی چوارەمـی نوێـژی عیشـا، ئـەم دەتوانێـت نیەتـی جیابوونـەوە لـە ئیمـام بهێنێـت و تەحیـات بخوێنێـت و سـەلام بداتـەوە، پاشـان بگاتـە نوێـژی عیشای ئیمامدا و لـە دوای سـەلام دانەوەی ئیمام هەستێتەوە و نوێژەکـەی تـەواو بـکات، لەسـەر بۆچوونـی هەنـدێ لـە زانایـان.

٤-ئەگەر کاتێ گەیشت نوێژی مەغریب تەواو ئەنجام درابوو واتە تەواو بووبوو، وە ڕکاتێ یان دوو ڕکات لە نوێژی عیشایش ئەنجام درابوو، لەم کاتەدا دروست نییە نوێژەکانی کۆبکاتەوە، چونکە کۆکردنەوەی نوێژەکانی لە دەس چووە، وە دەبێت نوێژی عیشا لەکاتی خۆیدا ئەنجام بدات، بەڵام دروستە بۆی نوێژی مەغریب لەگەڵ ئیمام ئەنجام بدات، کاتێ ئیمام نوێژی عیشا ئەنجام دەدات.

* تێبینی//

١-نوێژی بەیانی لە گەڵ هیچ نوێژێکدا کۆناکرێتەوە.

٢-نوێژی عەسر لەگەڵ مەغریب کۆناکرێتەوە.

٣-نوێژی نیوەڕۆ و عەسر پێکەوە کۆدەکرێتەوە، ئیتر بە پێش خستن بێت یان دواخستن.

٤-نوێژی مەغریب لە گەڵ نوێژی عیشا کۆدەکرێتەوە، چ نوێژی مەغریب ببەی بۆ لای عیشا یان بە پێچەوانەوە نوێژی عیشا بێنی بۆ لای مەغریب.

٥-کورت کردنەوەی نوێژەکان (قصرالصلاە) لەکاتی سەفەردا تەنها بۆچوار رکاتیەکانە، واتەبۆنوێژی (نیوەڕوو-عەسر-عیشایە) کەدەکرێن بەدوو رکاتی، نوێژی مەغریب وبەیانی وەکو خۆیان ئەنجام دەدرێن لە کاتی سەفەریشدا، واتە کورت ناکرێنەوە.



## بابەتەکانی ئەم بەشە

یەکێکی تر لەپایەکانی ئیسلام زەکات دانە:-

زەکات: واتە/ پاک بوونەوەو گەشەکردن یان بەرکەت تێ خستن، چونکە ئەو کەسەی زەکات دەدات خۆی پاک کردووەتەوە لەپیسکەیی، وە ماڵەکەی گەشەو بەرەکەت دار دەبێ بە هۆی زەکات دانەوە. وەکو خوای گەورە فەرموویەتی:

﴿خُذْ مِنْ أَمْوَٰلِهِمْ صَدَقَةً تُطَهِّرُهُمْ وَتُزَكِّيهِم بِهَا﴾ [التوبة ١٠٣]

واتە/ئەی محمد(دروودی خوای لەسەربێ)لە سامانەکانیان زەکات و سەدەقە وەربگرە دڵ و دەروونیان پێ پاکەوەکە، هەتا لە گوناهەکانیان پاک ببنەوە و، چاکەکانیان فراوان بێت، هەروەها زەکات بڕێکی کەمە کە مرۆڤی موسڵمان لەماڵەکەی دەری دەکات کە دەبێتەهۆی سڕینەوەی تاوانەکان و وە چاکەکردن لەگەڵ دروست کراوەکانی خوای گەورەدا، وە هەروەها زەکات دان دەبێتە هۆی خۆشەویستی نێوان مرۆڤەکان، چونکە کاتێ دەوڵەمەندەکان زەکاتەکانیان دەدەن بە هەژارەکان ئەوە ئەو ڕق و کینەیەی کە لە دڵیاندایە پاک دەبێتەوە بەرامبەر دەوڵەمەندەکان، هەروەها زەکات دان دەبێتەهۆی دابەزینی خێرو خێرات لە ئاسمانەوە، وەبەپێچەوانەوە بە نەدانی دەبێتەهۆی ڕیگری لەخەیرو خەیرات، وەکو پێغەمبەری خودا(دروودی خوای لەسەر بێ) فەرموویەتی: (مَامَنَعَ قَومٌ زَكَاةَ أَموَالِهِم إلاَّ مُنِعُوا القَطرَ مِنَ السَّمَاءِ)[1]

(١)أخرجه إبن ماجه برقم (٤٠١٩),وصَحه الألباني.

واتـه/ هـەر نـەتەوەیەک زەکاتـی ماڵەکانیـان نـەدەن و ڕێگری بکەن، ئیلا بـاران بارینیان لێ دەگیرێت لە ئاسمانەوە، هـەروەها زەکات دان یارمـەتی دەری لـێ قـەومـاوان و تێکۆشـەران و کویلەکان و گەشتیاران و قەرزارانە، هـەر لەبەر ئەمەیە زەکات دان سـوود و قازانجی زۆری تێدایـە بۆ مرۆڤایەتی، هـەر بۆیـە دانـراوە بـە پایەیـەک لـە پایەکانی ئیسـلام.

## حوکمی نەدانی زەکات

حوکمـی ئـەو کەسـانەی کـە زەکاتـی ماڵەکانیـان نـادەن دوو جـۆرن:-

١-کەسێـک ئینـکاری واجبێتـی زەکات دان بـکات و بـاوەڕی پێ نەبێت، بە تێکڕای زانایان بێ بـاوەڕە، لەبەرئەوەی قورئان و پێغەمبـەری خـودای(دروودی خـوای لەسـەر بێـت) بـە درۆ خسـتووەتەوە، چونکـە چەندیـن بەڵگـە لەسـەر واجبێتـی زەکات دان هاتـووە.

٢-کەسێـک بـاوەڕی بـە واجبێتـی زەکات دان هەیـە، بـەڵام لەبەر پیسکەی و ڕەزیلـی زەکـات نـادات، لەپێشـەوا ئەحمەدەوە هاتـووە کـە فەرموویەتـی:

(تارکها بخلاً یکفر کتارك الصلاة کسلاً) واتە/ئـەوەی زەکات نـادات لەبـەر ڕەزیلـی بـێ بـاوەڕ دەبێ وەکو ئـەو کەسـەی کـە نوێژ ناکات لەبەر تەمبەڵی، هـەروەهـا خـوای گـەورەش دەربـارەی بێ بـاوەڕان فـەرموویەتی:

﴿ فَإِن تَابُوا وَأَقَامُوا الصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُا الزَّكَوٰةَ فَإِخْوَانُكُمْ فِي الدِّينِ﴾ [التوبة ١١]

واتە/ ئەگەر پەشیمان بوونەوە لە هاوبەش بڕیاردان، وە نوێژیان ئەنجام داو وزەکاتی ماڵەکانیان دا، ئەوە براتانن لە ئایندا، بۆیە هەندی لەزانایانی حەنابیلە دەربارەی ئەم ئایەتە فەرموویانە:نەرێی (نەفی) برایەتی لە ئایندا ناکرێت، مەگەر بە دەرچوون لە ئاین نەبێت، وە خوای گەورەش ئثباتی برایەتی کردووە لەسەر ئەم سێ خاڵە: پەشیمان بوونەوە لە هاوبەش دانان(التوبة من الشرک)، وە ئەنجام دانی نوێژ (وإقامة الصلاة)، زەکات دان(وإیتاء الزکاة)، بەلام لای زۆربەی زانایان:- ئەو کەسەی کەلەبەر چروکی زەکات نادات بێ باوەڕ نابێت، بەلام تاوانی گەورەی ئەنجام داوە بە نەدانی زەکات، بۆیە دەکەوێتە ژێر ویستی خوای گەورەوە کە ئایا لێی خۆش دەبێ یان نا، هەر وەکو پێغەمبەری خودا(دروودی خوای لەسەر بێ) دەربارەی ئەو کەسانەی زەکات نادەن فەرموویەتی:

(ثُمَّ يُرَى سَبِيلُهُ إِمَّا إِلَى الجَنَّةِ وَإِمَّا إِلَى النَّارِ).[١]

واتە/ پاشان ڕێگای پێ نیشان دەدرێ یان بۆ بەهەشت یان بۆ ئاگر، واتە ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە بێ باوەڕ نابێ بە نەدانی زەکات، چونکە ئەگەر بێ باوەڕ بووایە ڕێگەی بەهەشتی بۆ نەبوو، دەست بەجێ دەیفەرموو بۆ ئاگرە، والله اعلم.

---

(١)أخرجه المسلم برقم (٩٨٧).

## مەرجـەکانی واجـب بـوونی زەکات *(شروط وجـوب الـزكاة)

١-ئـازادی (الحـرية):-زەکات واجب نییە لەسـەر بەندە(العبد) لەبەرئـەوەی خاوەنـی مـاڵ نییـە، هـەر چی هەیـە گەورەکـەی (السيد) دەبێتـە خاوەنی، هـەر وەکـو ئیبن عومـر فەرموویەتی:

(لَيسَ فِي مَالِ العَبدِ زَكَاةٌ حَتَّى يُعتِقَ).[١] واتە/ زەکـات دان لـەماڵی بەندەدا نییە هەتاکو ئازاد دەبێت.

٢-ئیسـلام بـوون(الإسلام):-زەکات واجب نییـە لەسـەر بێ بـاوەڕ (الكافـر) بـە بۆچوونـی ئێکـرای زانایـان، هـەر وەکـو خـوای گـەورە فەرموویەتـی:

﴿ وَمَـا مَنَعَهُـمْ أَن تُقْبَـلَ مِنْهُـمْ نَفَقَتُهُـمْ إِلَّا أَنَّهُـمْ كَفَـرُوا بِـاللَّهِ وَبِرَسُـولِهِ﴾ [التوبـة ٥٤] واتـە/ چ شـتـێک ڕێگری کـرد لـە مـونافیقەکان کەخـوای گەورە خێرەکانیان لێ وەربگرێ، تـەنها لـەبەر ئـەوە نـەبێ کـە ئـەوان بێ باوەڕ بوون بە خوای گەورەو پێغەمبەرەکـەی (درووودی خـوای لەسـەر بـێ).

٣- دەبێـت ئـەو مـاڵـە لـەو بـەشانە بێت کـە زەکاتیان تێدا واجبە:وەکو (ئاڵتون-زیو-مـەڕ و بزن و ووشترو مانگا-گەنم و جۆ و خورمـا و مێـوژ).

*ئـەم شـتانە بەئێکرای زانایان زەکاتیان تێدا واجبە، لەگەل ئەمانەشدا هـەنـدێ شـی تـر هەیـە زانایـان جیاوازیـان هەیـە لەسـەری کـە ئایـا زەکاتیـان تێدا واجـبە یـان نا؟ کەبـاس

(١)بسند الصحيح، أخرجه البيهقي برقم(٤/١٠٨).

لەهەندێکیان دەکەین لە دواتردا.

٤-دەبێت ماڵەکە گەیشتبێتە حەدی نیصاب(النصاب) یان ئاستی زەکات، کە هەر بەشەوە ئەندازەی خۆی هەیە، کە دواتر باسی لێدەکەین، چونکە هەر ماڵێک نەگاتە ڕادەی زەکات، زەکاتی تێدا واجب نییە.

٥-دەبێت ماڵەکە ساڵێکی کۆچی(هِجری) بەسەردا تێپەر بووبێت، وە سەرەتای ساڵەکەش لەو کاتەوە دەست پێدەکات کە ماڵەکە دەگاتە ڕادەی زەکات، هەر کاتێ ماڵەکەی گەیشتە ڕادەی زەکات ساڵێکی کۆچی هەژمار دەکات پاشان زەکاتی ماڵەکەی دەدات، بەڵام ئەم مەرجە زەکاتی دانەوێڵە و بەرووبوومی کشتوکاڵی ناگرێتەوە، چونکە ئەم جۆرانە هەر لەرۆژیی چنینەوەو دورینـدا، دەبێت زەکاتەکەی دەر بکرێت، چاوەڕێی ئەوە ناکرێ ساڵ بەسەریداتێپەڕێت، هەر وەکو خوای گەورە فەرموویەتی:

﴿ وَءَاتُوا حَقَّهُۥ يَوْمَ حَصَادِهِۦ ﴾ [الأنعام ١٤١] واتە/لە ڕۆژی دروێنەو میوە چنینیشدا بەشەکەی خوا جیا بکەنەوە، واتە زەکاتی لێبدەن.

٦-دەبێت ماڵەکە ماڵی تەواوی خۆی بێت، ماڵی کەسێکی تر نەبێت، چونکە خوای گەورە فەرموویەتی:

خُذْ مِنْ أَمْوَٰلِهِمْ صَدَقَةً [التوبة ١٠٣] واتە/ لە ماڵەکانیان زەکات و خێر وەربگرە.

## ئایا زەکات واجبە لە ماڵی منداڵ و بێ عەقڵدا

زانایان لەم بارەیەوە دوو بۆچوونیان هەیە:-

١-لای پێشەوا ئەبو حەنیفەو هەندێ لە سەلەف زەکات لە ماڵی منداڵ و بێ عەقڵدا واجب نییە، چونکەناسەپێندرێ بەسەریاندا یان تەکلیفیان لەسەر نییە.

٢-لای زۆربەی زانایان زەکات واجبە لە ماڵی منداڵ و بێ عەقڵدا بە گشتی، چونکە بەڵگەکان واجبێتی زەکات دەردەخات لە ماڵی دەوڵەمەند بە گشتی، منداڵ و بێ عەقڵی جیانەکردووەتەوە، وەکەس و کارەکەیان هەڵ دەستێ بەدەرکردنی زەکاتی ماڵەکانیان، هەروەها لە هاوەڵانی پێغەمبەری خودا(دروودی خوای لەسەر بێ) بۆچوونی پێشەوا عومەر و عەلی و ئیبن عومەر و جابری کوڕی عبد الله یشە(ڕەزای خوایان لەسەربێ).

## ئەو بەشانەی کە زەکات تییاندا واجبە

ئەو بەشانەی کە زانایان جیاوازیان نییە تیایدا نۆ دانەن:-

(ئاڵتون و زیو-ووشتر و مانگا و مەڕ و بزن-گەنم و جۆ و خورما و مێوژ).

## زەکاتی ئاڵتون و زیو

زەکات لە زێڕ و زیودا واجبە ئەگەر بگاتە ڕادەی زەکات

دان، وە ساڵێکی کۆچی بەسەردا تێپەڕبوبێت، وەیەک جار زەکاتیان لێ دەدرێت لە هەر ساڵێکدا.

## ڕادەی زەکاتی زێڕ و زیو (نصاب الذهب والفضة)

زێر زەکاتی لێ نادرێت هەتا نەگاتە بیست دینار (٢٠مسقاڵ) کاتێک گەیشتە بیست میسقاڵ وە ساڵێکی کۆچی بەسەر دانانیدا تێپەڕی ئەوا چارەکی دەیەکی (رُبعُ العُشر) زەکاتی لەسەرە، واتە لە(چل بەشدا یەک بەش) کەواتە لە بیست مسقاڵدا نیو مسقاڵ زەکاتی لەسەرە، هەر چەندە زیاتر بێ بەو شێوە یە هەژماری دەکەی.

هەروەها زیویش زەکاتی لەسەر نییە هەتا نەگاتە دوو سەد دیرهەم (٢٠٠درهم)، کاتێ گەیشتە دوو سەد دیرهەم وە ساڵێک بەسەر دانانیدا تێپەڕی ئەوە چارەکی دە یەکی (رُبعُ العُشر) زەکاتی لەسەرە، واتە لە چل بەشدا یەک بەش، هەر وەکو پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی:

(لَيسَ عَلَيكَ شَيءٌ-يَعني فِي الذَّهَبِ- حَتَّى يَكونَ لَكَ عِشرونَ ديناراً، فَأذا كَانَت لَكَ عِشرونَ ديناراً وحَالَ عَليهَا الحَولُ فَفيهَا نِصفُ دينارٍ، فَمَا زادَ فَبِحِسابِ ذَلك). [1]

هەروەها دەربارەی زیویش فەرموویەتی (ﷺ) (لَيسَ فِيمَا دُونَ خَمسَ أوُاقٍ مِنَ الوَرِقِ صَدَقَة).[2]

---

(١)أخرجه أبو داود برقم (١٥٧٣)، و صححه الألباني.

(٢)أخرجه البخاري برقم (١٤٨٤) ومسلم (٩٧٩).

واتــە/ لەپێنــج وقییــە کــەم تـر لـە زیـو زەکات نییە، کە(پێنج وقییە= ٢٠٠ دیرهــەم)، چـونکە یـەک وقییە =٤٠ دیرهـەم، یـەک دیرهەمیش=٢,٩٧٥گرام، کەواتـە (٢٠٠) دیرهـەم =٥٩٥گرام زیو.

هــەروەها (٢٠) مسـقاڵ زێڕیش بەگرام =٨٥گرام زێڕ، چونکە یـەک مسـقاڵ زێر =٤,٢٥گرام(غرام)لـە کۆندا.

بەڵام لـە ئێستادا یـەک مسقاڵ زێر = ٥ گرام، ٨٥ گرام زێر ÷ ٥ گـرام = ١٧ مسـقاڵ زیڕ، کەواتـە لـە ١٧ مسـقاڵ زێڕی عەیار (٢٤)دا زەکات دەکەوێت، بـەڵام ئەگـەر زێڕەکە عەیـار (٢١) بـوو ئـەوە لـە١٩،٥ مسـقاڵدا زەکات دەکەوێت، وە ئـەگەر زێڕەکە عەیار (١٨) بـوو ئـەوە لـە ٢٢،٥ مسـقاڵدا زەکات دەکەوێت.والله اعلم.

تێبینی// نیسابی عەیار (٢١ و ١٨ ) بەم رێگەیە دەردەکرێت:-

(کێشــی زێــڕ × ٢١ ) ÷ ٢٤ = کێشــی زێڕەکــە بــە عــەیــار (٢٤)(کێشــی زێـڕ × ١٨ ) ÷ ٢٤ = کێشـی زێرەکـە بـە عـەیـار (٢٤)بۆنموونــە: کــەســێ (١٠٠) گــرام زێــری عــەیــار (٢١) یەکـی هــەیــە ئــەوە ( ١٠٠ × ٢١ ) ÷ ٢٤ = ٢١٠٠ ÷ ٢٤ =٨٧,٥ گـرام زێــری عــەیــار (٢٤) ئەگــەر بیکەیــن بــە میسـقاڵ (٨٧,٥ ÷ ٥ ) = ١٧,٥ مسقاڵ زێـری عـەیـار (٢٤) چـونکە یـەک مسقاڵ = ٥ گرام، پاشان نرخی (١٧,٥ ) مـسـقاڵ زێـڕی عەیار (٢٤) چەندە لە (١٠٠) دا (٢,٥ ) زەکات دەدرێـت. واللـه اعلـم.

## تێکەڵ کردنی زێڕ و زیو بۆ تەواوکردنی ڕادەی نیصاب(النصاب)

ئەگەر کەسێ خاوەنی هەندێ لە زێڕ بێ نەگەیشتبێتە ڕادەی زەکات، وە خاوەنی هەندێ لە زیویش بێ نەگەیشتبێتە ڕادەی زەکات، ئایا دەبێت تێکەڵیان بکات بۆ ئەوەی بە هەر دووکیان بگاتە ڕادەی زەکات و وەزەکاتەکەیان بدات یان نا، بۆ نموونە کەسێ خاوەنی (١٥)مسقاڵ زێڕ و (١٥٠)دیرهەمی زیوە، هیچ کامیان نەگەیشتووە بە ڕادەی زەکات، ئایا دەبێت هەردووکیان تێکەڵ بکات بۆ ئەوەی بگات بەڕادەی زەکات، وە زەکاتیان لێ بدات یان نەخێر زەکاتیان لەسەر نییە، چونکە هیچ کامیان نەگەیشتووە بە ڕادەی زەکات، لەم بارەیەشەوە زانایان دوو ڕای جیاوازیان هەیە:-

١-زۆربەی زانایانی وەکو حەنەفییەکان ومالکییەکان و وەڕیواتێکیش لە پێشەوا ئەحمەدەوە فەرموویانە:دەبێت زێڕ و زیوەکە تێکەڵ بکرێت بۆ ئەوەی ڕادەی زەکات تەوا بکەن، پشان زەکاتەکەی دەربکرێت، بەڵگەیەشیان ئەوەیە کەزێڕ و زیو هەر دووکیان پارەن و سوود و قازانجیان یەکە، وە مەبەست تییاندا کڕین و فرۆشتنە، واتە ئەگەر کەسێ خاوەن(١٠) مسقال زێڕو(١٠٠) دیرهەم زیو بێت، زەکاتی لەسەرە.

٢-ڕێبازی شافعیەکان و ڕیوایەتێک لە پێشەوا ئەحمەد و ڕای ئیبن حەزم و ئەلبانی و ئیبن عوسەیمینیش ئەوەیە کە نابێ تێکەڵ بکرێ چونکە زێڕ وزیو دوو ڕە گەزی (جنس) جیاوازن و هەریەکەیان ڕادەی زەکاتی تایبەتی خۆی هەیە،

هەر وەکو چۆن مانگا و مەڕ تێکەڵ ناکرێن، وە هەریەکیان ڕادەی خۆی هەیە لەگەڵ ئەوەشدا مەبەست لە مانگاو مەڕدا یەکە، کە هەر دووکیان بۆ زیاد کردن و گەشەکردنە.

ڕای پەسەند:- ئەوەیە کە زێڕو زیو تێکەڵ ناکرێن بۆ ئەوەی ڕادەی زەکات تەواو بکەن، چونکە هەر یەکەیان ڕادەی زەکاتی تایبەتی خۆی هەیە، هەر وەکو لەپێشتردا باسی ڕادەی زەکاتی زێڕو زیومان کرد، لە فەرموودەکانی پێغەمبەری خودا(دروودی خوای لەسەر بێ).

## زەکاتی پارە وکاغەز و سەندە بانکییەکان

هەر کاتێ پارە و کاغەز و سەندە بانکییەکان گەیشتە ڕادەی زەکات و ساڵیان بەسەردا تێپەڕی بێت دەبێ زەکاتیان لێ بدرێت، چونکە هەمان حوکمی زێڕ و زیویان هەیە وە هەمان کاری زێڕ و زیو ئەنجام دەدەن، بەڵام زانایان جیاوازیان هەیە کە ئایا ڕادەی زەکاتی پارە و کاغەز و سەنەدە بانکییەکان بەڕادەی زەکاتی زێڕ یان بەڕادەی زەکاتی زیو دەخەملێنرێت، هەندێ لە زانایان بەڕادەی زەکاتی زیو دەیخەملێنن، چونکە سوود و قازانجی هەژارانی زیاتر تێدایە، بەڵام ڕای پەسەند ئەوەیە بەڕادەی زەکاتی زێڕ دەخەملێنرێت، چونکە نرخی زیو زۆر دابەزییوە لەچاو سەردەمی پێغەمبەری خودا(درودی خوای لەسەر بێ)، بەپێچەوانەوە نرخی زێڕ تاڕادەیەکی باش

وەکو خۆی ماوەتەوە.

## چۆنێتی دەرکردنی زەکاتی پارە

١-(ڕێگەی یەکەم):- کۆی پارە ÷ ٤٠ = بڕی زەکاتی پارەکە.

بۆنموونە:-کەسێک (٥٠٠٠٠٠٠) دیناری هەبێت ئەوا:- ٥٠٠٠٠٠٠÷٤٠= ١٢٥٠٠٠ دینار، کەواتە لە (٥) ملیون دینار(١٢٥) هەزار دینار زەکاتی لەسەرە.

٢-(ڕێگەی دووەم):- (کۆی پارەکە ×٢,٥) ÷١٠٠ = بڕی زەکاتی پارەکە: بۆ نموونە (٥٠٠٠٠٠٠×٢,٥ ) ÷ ١٠٠ = ١٢٥٠٠٠٠٠ ÷ ١٠٠ = ١٢٥٠٠٠ دینار.

## زەکاتی خشڵ (زێڕ و زیو)

زانایان جیاوازیان هەیە لە بارەی زەکاتی خشڵی( زێڕ و زیو) ی ئافرەتان، کە بگاتە ڕادەی زەکات:

١-لای زۆربەی زانایان و ئیبنول عومەر و جابر و عائیشە و ئەسمای کچی ئەبو بەکر(ڕەزای خوایان لەسەربێت)، لەسەر ئەوەن کە خشڵی ئافرەتان زەکاتی لەسەر نییە، هەر وەکو ئیبن عومەر فەرموویەتی:

(لَيسَ فِي الحُلّي زَكَاة )[1]، واتە/زەکات نییە لە خشڵی ئافرەتاندا.

(١)صحيح أخرجه عبد الرزاق برقم (٨٢/٤)ودار قطني (١٠٩/٢).

٢-لای ئەبو حەنیفە وئیبن حەزم و ئیبن عوسەیمین و ئیبن باز، زەکات واجبەلە خشڵی ئافرەتان، ئەگەر بگاتە ڕادەی زەکات(نیصاب)، هەروەها لای هاوەڵان ڕای ئیبن عەباس و ئیبن مەسعودیشە، چونکە بەڵگەکان بە گشتی هاتووە دەربارەی زەکاتی زێڕو و زیو، وە ئەم جیاوازیەش کە هەیە دەربارەی خشڵ بۆ خشڵێکە کە حەڵاڵ بێت بەکارهێنانی بۆ ئافرەتان، بەڵام ئەگەر خشڵێک بوو کە حەرام بوو بەکارهێنانی وەکو خشڵی قاپ و قاچاغی زێڕ و زیو یان تایبەت بوو بە پیاوانەوە وەکو شمشێر، ئەوە واجبە زەکاتیان لێ دەر بکرێت، ئەگەر گەیشتبێتە ڕادەی-ئاستی زەکات، لەگەڵ ئەوەشدا حەرامە بە کارهێنانیان، هەروەها ئەگەرپیاویش خشڵی ئافرەتانی هەڵگرت لە ماڵەوە بۆ هەر مەبەستێ واجبە زەکاتی لێ دەربکات ئەگەر گەیشتبێتە ڕادەی زەکات بەبێ جیاوازی لە نێوان زانایاندا.

## زەکات لە مووچە و کرێی خانوو وکرێی دوکان و کرێی ڕۆژانەدا

ئەگەر کەسێک ئەوەندە پارەی هەبوو گەیشتبێتە ڕادەی زەکات، لەگەڵ ئەوەشدا مانگانەو ڕۆژانە هەندێ پارەی دەس کەوێت، ئەوە باشترە لە گەڵ ئەو پارانەی کە ساڵی بەسەردا تێپەڕییوە زەکاتی ئەو بەشە پارەیەشی بدات، بەڵام دەتوانێت زەکاتی ئەو بەشە پارەیە نەدات، کە مانگانەوە ڕۆژانە دەستی کەوتووە، کە ساڵی بەسەردا تێ پەڕی ئەو کاتە زەکاتی ئەو بەشەش بدات، بۆ نموونە/ئەگەر کەسێ (١٠)ملیۆن دیناری لە

ماڵدا هەبێ و ساڵی بەسەردا تێپەڕی بوو دەبێت زەکاتەکەی بدات، لە گەڵ ئەوەشدا چەند ڕۆژێک یان یەک دوو مانگ پێشتر (یەک ملیۆن)تری دەس کەوتووە، باشترە زەکاتی ئەم یەک ملیۆنەش لەگەڵ زەکاتی (١٠)ملیۆنەکەی تردا بدات، بەڵام دروستیشە زەکاتی ملیۆنەکە نەدات هەتا وەکو ساڵی بەسەردا تێپەڕ دەبێت، پاشان زەکاتی ئەو یەک ملیۆنەش بدات.

## زەکاتی ماڵێك کە درابێت بەقەرز

١-قەرزێک ئومێدی دانەوەی هەبێت، بەوەی کە لەلای کەسێک بێ توانای دانەوەی هەبێت و دانی پێدابنێت، ئەوە دەبێت لەگەڵ ئەو پارەیەی کە لە لای خۆیەتی وە لەماڵەوەیە ئەژمێری بکات و زەکاتی هەمووی دەر بکات، بەڵام دروستیشە زەکاتی ئەو پارەیە نەدات کە لە قەرزدایە، کاتێ وەریگرێتەوە زەکاتی ئەو چەند ساڵەی بدات کە لە قەرزدا بووە.

٢-قەرزێک ئومێدی دانەوەی نەبێت، بەوەی کە لە لای کەسێک بێت توانای دانەوەی نەبێت، یان ئینکاری بکات کە قەرزی لایە، ئەوە لەم کاتەدا زەکاتی ئەو پارەیە نادات کە لە قەرزدایە، بەڵام کاتێک دەستی کەوتەوە دەبێت زەکاتی ساڵانی ڕابردووی لێ دەربکات کە لە قەرزدا بووە، وە لای هەندێ لە زانایان تەنها زەکاتی یەک ساڵ دەر دەکات کاتێک وەری بگرێتەوە.

## کەسێك قەرزی لەسەر بێت ئایا زەکاتی لەسەرە

١- زەكات واجبە لەسەر كەسێک ئەگەر ماڵەكەی گەیشتبێتە ڕادەی زەكات و ساڵی بەسەردا تێ پەڕبووبێت با قەرزاریش بێت، ئەمەش ڕای تازەی پێشەوا شافعییەو وە ڕای بن باز و ئیبن عوسەیمین و لیژنە دائیمەشە.

٢-لای هەندێ زاناش ئەگەر كەسێ هەندێ ماڵی بە دەستەوە بوو كە زەكاتی لەسەر بێت، لەگەڵ ئەوەشدا قەرزاربێت، ئەگەر ئەوەندە قەرزار بێت كە ماڵەكەی لەڕادەی زەكات كەم بكاتەوە یان ئەوەندە ماڵی هەبێت كە بەشی قەرزاریەكەی بكات لەم كاتەدا زەكات لەسەری واجب نییە، بەڵام ئەگەر ئەوندە قەرزار بوو ماڵەكەی لە ڕادەی زەكات كەم نەكاتەوە ئەو دەبێت زەكاتی ماڵەكەی خۆی بدات، بۆ نموونەئەگەر كەسێ(٢٠)مسقاڵی هەبێت، بەڵام (٥)مسقاڵ قەرزاربێت، ئەوە زەكاتی لەسەر واجب نییە، چونكە (١٥)مسقاڵی ماڵی خۆیەتی و نەگەیشتووە بە ڕادەی زەكات، بەڵام كەسێک ئەگەر(٣٠)مسقاڵ ئاڵتوونی هەبێت، بەڵام(٥)مسقاڵ قەرزار بێت، ئەوە دەبێت زەكاتی (٢٥)مسقاڵەكە بدات، چونكە گەیشتووە بە ڕادەی زەكات ماڵەكەی.

## زەکاتی مارەیی ئافرەتان

مارەیی ئافرەتان سەروەت و سامانە هەر وەكو سەروەت وسامانەكانی تر، دەبێ زەكاتی لێ دەر بكرێت ئەگەر

بگات بە ڕادەی زەکات، بەڵام ئەگەر ئافرەتەکە مارەییەکەی وەرنەگرتبێت، هەر وەکو ماڵی قەرز مامەڵەی لەگەڵدا دەکرێ، وەکو پێشتر باسمان کرد، هەر چەندە پێشەوا ئەبو حەنیفە ڕای وایە مارەیی ئافرەتان زەکاتی لەسەر نییە هەتا وەکو وەری نەگرێت.

## زەکاتی ئاژەڵ

زانایان کۆکن لەسەر ئەوەی زەکات واجبە لە ئاژەڵدا، لە ووشتر و ڕەشەوڵاخ و مەڕ و بزن، بەڵام زانایان جیاوازیان هەیە کە ئایا زەکات لە ئەسپ دا هەیە یان نا، لای زۆربەی زانایان ئەسپ زەکاتی لەسەر نییە، ئەگەر بۆ بازرگانی نەبێت با مەرجەکانی زەکاتیشی تێدا بێت، کە دواتر باس لە مەرجەکانی زەکاتی ئاژەڵ دەکەین، بەڵام ئاژەڵەکانی تری وەکو هێستر و گوێ درێژ و ئەوانی تر زەکاتیان لەسەر واجب نییە، مەگەر بۆ بازرگانی بن، ئەگەر بۆ بازرگانی بوون ئەو کاتە مامەڵەیی ماڵی بازرگانیان لەگەڵدا دەکرێت، کە ماڵی بازرگانی دەخەملێنرێ بە پارە، ئەگەر گەیشتبێتە ڕادەی زەکات ئەو کاتە زەکات لەسەری واجب دەبێت.

## مەرجەکانی واجب بوونی زەکات لە ئاژەڵاندا

١-دەبێت بگاتە ڕادەی زەکات(النصاب):کە دواتر باس لەڕادەی زەکاتی ئاژەڵان دەکەین.

٢-دەبێتساڵێکی کۆچی(هجری) بەسەریدا تێ پەڕی بێت،

لەبەر فەرموودەکەی پێغەمبەری خودا(دروودی خوای لەسەر بێ) کە فەرموویەتی:

(لاَ زَكَاةَ فِي مالٍ حَتَّى يَحُولَ عَلَيهِ الحَولَ).[1] واتە/ زەکات لەماڵێکدا نیە هەتا ساڵێکی بەسەردا تێدەپەڕێت.

٣-خۆلەوەڕبێت (سائمة): واتە/ بەشی زۆری ساڵ لەپوش و لەوەڕی دەشتاییەکان کە قەدەغە نییە بلەوەڕێت، ئەمەش ڕای زۆربەی زانایانە، جگە لە پێشەوا مالیک و لەیث کەفەرموویانە:زەکات واجبە لە ئاژەڵدا بە شێوەیەکی گشتی، چ خۆ لەوەڕبێت یان ئالف پێدراو بێت یان بۆ بار و ئیش بێت یان نا.

## ئاژەڵەکان چوار جۆرن

١-خۆ لەوەڕبێت(أن تكون السائمة):-ئەو ئاژەڵەی کە بەشی زۆری ساڵ لە دەرەوە بلەوەڕێت، وەبۆ شیر و بێچوو و زاوزێ بە خێوبکرێت، ئەم جۆرە ئاژەڵانە زەکاتیان تێدا واجبە.

٢-ئالف پێ دراو بێت (أن تكون معلوفة):-ئەم جۆرە ئاژەڵە خاوەنەکەی ئالیکی بۆدەکڕێ یان بۆی دەدوریتەوە، ئەم جۆرانە زەکاتیان تێدا واجب نییە، لای زۆربەی زانایان جیاواز لە پێشەوا مالیک.

٣-بۆ کرێ دانرابێت (أن تكون عاملة):- ئەم جۆرە ئاژەڵانە خاوەنەکەی بۆ کرێ داینا‌وە بۆ بار گواستنەوە یان بۆ

(١)أخرجه ابن ماجه برقم (١٧٩٢)وأحمد(١٢٦٥)وغيرهما،و صححه الألباني في صحيح الجامع.

سواربوون یان بۆ کێڵان و ئاودان، ئەم جۆرانەش زەکاتیان تێدا نییەلای زۆربەی زانایان جیاواز لەپێشەوا مالیک.

٤-بۆ بازرگانی دانرابێت(أن تكون معدَّة للتجارة):-ئەو ئاژەڵەی بۆ بازرگانی دانرابێت زەکاتی تێدا واجبەلای زۆربەی زانایان، بۆیە زەکات لەیەک ووشتر واجب دەبێت ئەگەر نرخەکەی بگاتە ڕادەی زەکات، بە مەرجێ بۆ بازرگانی دانرابێت، ئیتر چ خۆ لەوەڕبێت یان ئالَف پێدراوبێت یان بۆ کرێ و سواری بێت.

## زەکاتی وشتر

هەرکەسێ لە پێنچ ووشتر کەم تری هەبێت، نێربێت یان مێ، گەورەبێت یان بچووک، زەکاتی تێدا واجب نییە، لەبەر فەرموودەکەی پێغەمبەری خودا (درووودی خوای لەسەر بێت) کە دەفەرموویت:(لَيسَ فِيمَا دُونَ خَمسِ ذَودٍ مِنَ الإِبِلِ صَدَقَةٌ).[1]

واتە/ کەمتر لە پێنچ سەر لە ووشتر زەکاتی لەسەر نییە، بەلام ئەگەر بگاتە پێنچ سەر یان زیاتر، وەساڵیشی بەسەردا تێپەڕبووبێت، ئەوە لە هەر پێنچ سەر لە ووشتر، کاوڕە مەڕێکی(شَاة) یەک ساڵەی تێدا واجب دەبێت هەتاوەکو دەگاتە(٢٥)سەر ووشتر وەکو لەم خشتەیەدا ڕوونی دەکەینەوە:

(١)أخرجه البخاري برقم (١٤٤٧)ومسلم (٩٧٩).

## *ڕادەی زەکاتی ووشتر*

| له | هەتا | ئەندازەی زەکاتەکە |
|---|---|---|
| ١ | ٤ | زەکاتی تێدا نییە. |
| ٥ | ٩ | کاوڕێکی (شەك) یەك ساڵە لە مەڕ. |
| ١٠ | ١٤ | دوو کاوڕ لە مەڕ (یەك ساڵە). |
| ١٥ | ١٩ | سێ کاوڕ لەمەڕ (یەك ساڵە). |
| ٢٠ | ٢٤ | چوار کاوڕ لە مەڕ (یەك ساڵە). |
| ٢٥ | ٣٥ | یەك (بِنتُ مَخَاضٍ) بنت مخاص: ووشترێکی مێیە کە ساڵی تەواو کردبێت، چوبێتە دوو ساڵەوە، ئەگەر نەبوو ئەتوانێت (إبنَ لَبُونٍ) لـە جیـاتی بـدات، ابـن لبـون ووشترێکی نێرە کە دوو ساڵی تەواو کردووە. |
| ٣٦ | ٤٥ | یەك (بِنتُ لَبُونٍ) بنت لبون ووشترێکی مێیەیە کە دوو ساڵی تەواو کردووە چووتە سێ ساڵەوە. |
| ٤٦ | ٦٠ | یەك(حِقَّةٌ)حِقة:ووشترێکی مێیەیە سێ ساڵی تەواو کردووە. |
| ٦١ | ٧٥ | یەك (جَذَعَةٌ) جـذعة: ووشترێکی مێیەیە کـە چـوار ساڵی تەواو کردووە. |
| ٧٦ | ٩٠ | .(بِنتَا لَبُونٍ) واتە: دوو بنت لبون. |
| ٩١ | ١٢٠ | (حِقَّتَانِ) واتە: دوو حیقە.. |

ئەمە ئەو ئەندازەیەیە کە لە فەرموودەکەی ئەبو بەکر(ڕەزای خوای لێبێ) هاتووە لە پێغەمبەری خواوە(درووودی خوای لەسەر بێ)، وە هەروەها زانایان کۆکن لەسەری. بەڵام ئەگەر لە(١٢٠)سەر ووشتر تێپەڕێت، ئەوە زانایان جیاوازیان هەیە لەسەری، کە چۆن زەکاتی لێ دەدرێت، بەڵام لای زۆربەی زانایان ئەویە کە لە هەر(٤٠) سەر ووشتر (بنت لبون) یێک دەدرێت بە زەکات، وە لە هەر(٥٠) سەر وشتر (حقە)یەک دەدرێت بە زەکات، واتە: ژمارەی ووشترەکان بە چل سەر یان پەنجا سەر یان هەر دووکیان ڕێک دەخرێت، وەکو لەم خشتەیەدا ڕوونی دەکەینەوە:-

| لە | هەتا | ئەندازەی زەکاتەکە |
|---|---|---|
| ١٢١ | ١٢٩ | سێ (بنت لبون)، |
| ١٣٠ | ١٣٩ | یەك (حقە) و دوو (بنت لبون)، |
| ١٤٠ | ١٤٩ | دوو (حقە) و یەك (بنت لبون)، |
| ١٥٠ | ١٥٩ | سێ (حقە)، |
| ١٦٠ | ١٦٩ | چوار (بنت لبون)، |
| ١٧٠ | ١٧٩ | سێ (بنت لبون) و یەك (حقە)، |
| ١٨٠ | ١٨٩ | دوو (حقە) و دوو (بنت لبون)، |
| ١٩٠ | ١٩٩ | سێ (حقە) و یەك (بنت لبون)، |
| ٢٠٠ | ٢٠٩ | چوار (حقە) یان پێنج (بنت لبون)، |

بەم شێوەیەهەتاوەکو زیاتر بێت، واتە/لەهەر چل سەر ووشتر(بنت لبون) یێک دەدرێت بە زەکات، وە لە هەر پەنجا سەر ووشتر (حقە) یەک دەدرێت بە زەکات.

## چەند تێبینییەک دەربارەی زەکاتی وشتر

١-ئەو ووشترەی کە لە زەکاتدا وەر دەگیرێت دەبێت ووشتری مێ یە بێت لە هەموو کاتێکدا، تەنها لەیەک کاتدا نەبێت کە ئەویش ئەگەر (بنت المخاض) نەبوو، (ابن لبون) لە جیاتی وەر دەگیرێت، کە ووشترێکی نێرە دوو ساڵی تەواو کردووە.

٢-ئەو کاوڕەی (شاة) لەمەڕ کە لە زەکاتی ووشتردا وەردەگیرێ لە جیاتی وشتر، ئەگەر شەش(٦) مانگی تەواو کردبێت هەر دروستە بدرێت بە زەکات، (جذعة من الضأن) بەلام ئەگەر بزن بدرێت دەبێ ساڵی تەواو کردبێت، (ثنیة من المعز).

٣-ئەگەر خاوەن ماڵ لەو تەمەنەی بۆی دانراوە لە ووشتر، بۆ ئەوەی بیدات بە زەکات، ئەگەر تەمەنی گەورەتری دا بە زەکات دروستە، بۆ نموونە/ ئەگەر (بنت مخاض)ی لەسەر بوو ئەو (بنت لبون) یان (حقە) یەکی‌دا بەزەکات لە جیاتی (بنت مخاض)کە ئەوە دروستە، بەبێ جیاوازی لە نێوان زانایاندا، وە دەبێتە خێر و پاداشتێکی زیاتر بۆی.

٤-ئەگەر خاوەن ماڵ لە جیاتی شەکە مەڕەکە، ووشترێکی دا بەزەکات، ئەمە جیاوازی لە نێوان زانایاندا هەیە کە ئایادروستە

یان نا، لای پێشەوا ئەبو حەنیفە و شافعی و ڕای تەواوی مالکییەکان دروستە، بەڵام لای حەنابیلەکان دروست نییە، چونکە ئەوە لادانە لە فەرموودەکەی پێغەمبەری خودا(دروودی خوای لەسەربێت)کە تا (٢٥) ووشتر(شەکێ) لەمەڕ دەدرێت بە زەکات، ڕای پەسند دروستە، چونکە خوای گەورە کاتێک مەڕی واجب کردووە بۆ زەکاتی ووشتر تا دەگاتە(٢٥) ووشتر، وەکو بەزەی و ڕەحمەت بۆ خاوەن ماڵ دایناوە، بۆ ئەوەی بار قورسی نەکەوێتە سەری، هەروەها زانای سەردەمیش ئیبن عوسەیمین لە گەڵ ئەودایە کە دروستە.

## زەکاتی ڕەشەوڵاخ (مانگا)

زانایان کۆکن لەسەر واجبێتی زەکاتی ڕەشە وڵاخ کە بگاتە(٣٠)سەر، واتە ڕادەی زەکاتی ڕەشەوڵاخ، (٣٠)سەرە، ئەگەر لە (٣٠) سەر کەمتربوو زەکاتی تێدا واجب نییە، وەکو لەم خشتەیەدا ڕوونی دەکەینەوە:-

ڕادەی زەکاتی ڕەشەوڵاخ.

| لە | هەتا | ئەندازەی زەکاتەکە |
|---|---|---|
| ١ | ٢٩ | زەکاتی تێدا نییە. |
| ٣٠ | ٣٩ | یەك (تَبِیع) یان یەك (تَبِیعَة)، تبیع: گوێرەکەیەکی نێرە کە یەك ساڵی تەواو کردووە، چووەتە دوو ساڵەوە، تبیعە: گوێرەکەیەکی مێ یە کەیەك ساڵی تەواو کردووە چووتە دووساڵەوە، بۆیە پێدەوترێت (تبیع) چونکە شوێن دایکیان دەکەون. |

| ئەندازەی زەكاتەكە | هەتا | لە |
|---|---|---|
| یەك (مُسِنَّة) مُسنَّە:نوێنگیکی مێیە دوو ساڵی تەواو کردووە، بۆیە پێ دەوترێت(مُسِنَّة) چونکە دانی دەرکردووە، | ٥٩ | ٤٠ |
| دوو (تبیع)، | ٦٩ | ٦٠ |
| یەك (تبیع) و یەك (مُسِنَّة). | ٧٩ | ٧٠ |

پاشان لە هەر سی(٣٠)سەر ڕەشەوڵاخ(تبیع)ێک دەدەرێت بە زەکات، وە لەهەر (٤٠) سەر ڕەشەوڵاخ(مُسِنَّة)یەک دەدرێ بە زەکات، واتە:ژمارەی ڕەشە وڵاخەکان بەسی سەر یان چل سەر یان بە هەر دووکیان ڕێک دەخرێت، وەکو لەم خشتەیەدا ڕوونی دەکەینەوە:

| ئەندازەی زەكاتەكە | هەتا | لە |
|---|---|---|
| دوو (مُسِنَّة)، | ٨٩ | ٨٠ |
| سێ (تبیع)، | ٩٩ | ٩٠ |
| دوو (تبیع) و یەك (مُسِنَّة)، | ١٠٩ | ١٠٠ |
| یەك (تبیع) و دوو (مُسِنَّة)، | ١١٩ | ١١٠ |
| چوار (تبیع) یان سێ (مُسِنَّة)، | ١٢٩ | ١٢٠ |

پاشان بەم شێوازە هەتا وەکو زۆر تر بێت، واتە:لە هەر سی سەررەشەوڵاخ(تەبیع)ێک دەدرێت بە زەکات، وە لە هەر (٤٠) سەر رەشە وەڵاخ (مُسِنَّة)یەک دەدرێت بە زەکات،

تێبینی//

١- زانایان کۆکن لەسەر ئەوەی کە گوێرەکەی نێر (تبیع) وەردەگیرێت لە زەکاتی ڕەشەوەڵاخدا لە جیاتی گوێرەکەی مێ یە (تبیعە).

٢-زانایان جیاوازیان هەیە کە ئایا نوێنگی نێر(المُسِنّ) وەردەگیرێت لە زەکاتی ڕەشە وەڵاخدا لە جیاتی نوێنگی مێ (المُسِنَّة) یان نا، بەلای زۆربەی زانایانەوە دروست نییە وەربگیرێت، چونکە فەرموودەکان باس لە نوێنگی مێ یە دەکەن.

٣-گامێش هەمان حوکمی ڕەشە وەڵاخی هەیە لە زەکات داندا، واتە هەر وەکو ڕەشەوەڵاخ زەکاتی گامێشیش دەدرێت.

## زەکاتی مەڕ و بزن

ڕادەی(نصاب)زەکاتی مەڕ و بزن (٤٠) سەرە، واتە هەتاوەکو نەگاتە(٤٠) سەر زەکاتی تێدانییە یان واجب نابێت، کە گەیشتە (٤٠) سەر کاوڕە مەڕێکی(شاە) یەک ساڵەی تێدا واجب دەبێت، هەتاوەکو (١٢٠) سەر، وەکو لەم خشتەیەی خوارەوە ڕوونی دەکەینەوە:-

## ڕادەی زەکاتی مەڕ و بزن

| ئەندازەی زەکاتەکە | هەتا | لە |
|---|---|---|
| زەكاتی تێدا نییە، | ٣٩ | ١ |
| یەك كاوڕی (شاة) یەك ساڵە، | ١٢٠ | ٤٠ |
| دوو كاوڕ (شاتان)، | ٢٠٠ | ١٢١ |
| سێ كاوڕ (ثلاث شیاة)، | ٣٩٩ | ٢٠١ |

پاشان لە هەموو (١٠٠) سەرێ كاوڕێکی (شاه) یەک ساڵەی دەکەوێتە سەر، وەکو لەم خشتەی تردا ڕوونی دەکەینەوە:-

| ئەندازەی زەکاتەکە | هەتا | لە |
|---|---|---|
| چوار كاوڕ (شاة)، | ٤٩٩ | ٤٠٠ |
| پێنچ كاوڕ (شاة)، | ٥٩٩ | ٥٠٠ |
| شەش كاوڕ(شاة)، | ٦٩٩ | ٦٠٠ |
| حەوت كاوڕ(شاة). | ٧٩٩ | ٧٠٠ |

بەم شێوازە هەتا وەکو زۆر تربێت لە هەموو(١٠٠) سەری یەک کاوڕ دەدرێت بەزەکات لای زۆربەی زانایان.



تێبینی//

١-زانایان کۆکن لەسەر ئەوەی کە بزن هەمان حوکمی مەڕی هەیە، بۆ نموونە/کەسێ(٢٠) سەر مەڕو (٢٠) سەر بزنی هەبێت زەکات دەکەوێتە سەری.

٢-ئەو کاوڕەی کە دەدرێت بە زەکات دروستە چ لەمەڕ بێت یان بزن، نێر یان مێ بێت، کە ئەمەش ڕای حەنەفییەکان و مالکیەکان و ئیبن حەزمە.

## چەند تێبینییەکی گشتی لە زەکاتی ئاژەڵاندا

١- هەرکەسێک ئاژەڵەکانی گەیشتە ڕادەی زەکات، وە لە ماوەی ئەو ساڵەدا هەندێ لە ئاژەڵەکانی بێچوویان بوو(زان) ئەوە پێویستە زەکاتی هەموویان دەربکرێت، کاتێ ساڵ بەسەر ئاژەڵە گەورەکاندا تێ پەڕی، واتە بێچووەکانیش هەژمار دەکرێ لە کاتی زەکات دانە هەر وەکو گەورەکان، ئەمەش ڕای زۆرێک لە زانایانە.

٢-ئەو زیادانەی کە لە نێوان دوو فەرزدایە کەپێی دەوترێ (الأ وقاص) عەفوو-لێبورنی لەسەرە لای زۆربەی زانایان، بۆ نموونە ئەو سەر مەڕانەی کە لە نێوان(٤٠) بۆ (١٢٠)دایە زەکاتی لەسەرنییە، واتە کەسێک (٤٠)سەر مەڕی هەبێت یەک

کاوڕ زەکات دەدات بە هەمان شێوە، (١٢٠)سەریشی هەبێت هەر یەک کاوڕ دەدات بە زەکات، ئەو زیادەیەی سەروی(٤٠) سەر هەتا(١٢٠)سەر عەفووی لەسەرە.

٣-نابێت باشترین ئاژەڵەکان هەڵبژێرێت بۆ زەکات، مەگەر خاوەنەکەی ڕازیبێت، هەروەها نابێت ئاژەڵی عەیبداریش هەڵبژێرێت یان وەر بگیرێت، وەکو نەخۆش و پیرو لاواز و کوێر و شەلێیش کە ببێتەهۆی لاواز بوونی.

٤-ئەو کەسانەی ئاژەڵی هاوەبەش(شەریک)یان هەیە پێکەوە، نابێت لە ترسی زەکات، لەکاتی زەکات دان لە یەکیان جیابکەنەوە بۆ ئەوەی زەکات نەدەن، بۆ نموونە/ دوو کەس شەریکن هەر یەکەیان(٣٠)سەر مەڕی هەیە، کە بە هەردووکیان دەگاتە (٦٠) مەڕ، کە کاوڕێکی (شاە) لەسەرە، بۆ ئەوەی زەکات نەدەن لە یەکیان جیادەکەنەوە، وە هەریەکەیان (٣٠) سەر مەڕەکەی خۆی دەبات، لەم کاتەدا هیچیان زەکات ناکەوێتە سەریان، چونکە (٣٠)سەر مەڕ زەکاتی تێدا نییە، وەکو پێشتر باسمان کرد، ئەم جۆرە کارانە ناشەرعییەو دروست نییە و هەر دوولایان تاوانبار دەبن، وە هەروەها ئەو کەسانەش کە لە کاتی زەکات داندا ماڵەکانیان تێکەڵ دەکەن بۆ ئەوەی زەکاتی کەمییان بکەوێتە سەر، ئەم کارەش نا شەرعییە و تاوانبار دەبن و زەکاتەکەشیان هەر لەسەر دەمێنێ، بۆ نموونە/ دوو کەس هەر یەکەیان (٤٠) سەر مەڕی هەیە، لەم کاتەدا هەریەکەیان کاوڕێ (شاە) لە مەڕ زەکاتی لەسەرە، ماڵەکانیان(ئاژەڵەکانیان) تێکەڵ دەکەن کە بەهەردووکیان(٨٠) سەر دەکات، وە لەم کاتەدا(٨٠)

سەر یەک کاوڕ زەکاتی لەسەرە، بۆ یە هەر دووکیان یەک کاوڕ دەدەن بە زەکات، کە ئەمیش بە هەمان شێوە دروست نیە.

٥-پارەدان لەجیاتی ئاژەڵەکە لە کاتی زەکات داندا، واتە نرخی ئاژەڵەکە چەندە کە دەدرێت بەزەکات، نرخەکەی بدەیت بەزەکات لە جیاتی ئاژەڵەکە، ئەم کارەلای زۆربەی زانایان دروست نییە، چونکە فەرموودەکان جۆر و ڕەگەزی ئاژەڵەکەی دیاری کردووەکە دەدرێت بە زەکات، بەڵام لای ڕێبازی حەنەفییەکان دروستە نرخ بدرێت لە زەکاتدا، چ زەکاتی ئاژەڵ بێ یان زەکاتی فیتر(الفطر) بێت یان نەزرو کەفارەت بێت، وە لای هەندێ لە زانایانیش بۆ کاتی پێویست یان بۆ بەرژەوەندی دروستە وەکو کەسێ (٥) سەر وشتری هەیە کە کاوڕێ لە مەڕ زەکاتەکەیەتی، وە کاوڕەکەشی لا دەست ناکەوێت، دروستە پارەکە بدات بە زەکاتەکە.

## زەکاتی ماڵی بازرگانی

ماڵی بازرگانی ئەو ماڵەیە کە بۆ کڕین و فرۆشتن دادەنرێت بە مەبەستی قازانج و سوود.

## حوکمی ماڵی بازرگانی

لای زۆربەی زانایان زەکات لە ماڵی بازرگانیدا واجبە، وەکو خوای گەورە فەرموویەتی:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَنفِقُواْ مِن طَيِّبَٰتِ مَا كَسَبۡتُمۡ﴾ [البقرة ٢٦٧]

واتـە/ئـەی ئەوانـەی باوەڕتـان هێنـاوە ببـەخشن لـە پاکترین وحـەڵاڵ ترین شت کە بە دەستان هێناوە.

ئـیبن ئـەلعەربی فەرموویەتـی:- زاناکانمـان فەرموویانـە ووتەی(ماکسـبتُم) واتە:ئـەو ماڵـەی کـە لـە بازرگانـی دەسـتان کـەووتووە، هەروەهـا لەبـەر چەندین بەڵگـەی تر کـە بـە شێوەیەکی گشتی هاتووە، هەرچەندە لای هەندێ لـە زانایانـی وەکـو ڕێبـازی زاهیرییـەکان و پێشـەوا ئەلبانـی و شـەوکانی و صدیق خان و ئیبن حـەزم بۆ ئـەوە چوونـە کە زەکات لـە ماڵی بازرگانیـدا واجب نییـە، ڕای پەسـەند:ئەوەیە زەکات لـە ماڵـی بازرگانیدا واجبە وەکـو زۆربـەی زانایـان فەرموویانـە، چونکـە ئەگـەر زەکات لـە ماڵی بازرگانیدا واجب نەبێت ئـەوە زۆربـەی دەوڵـەمـەندەکـان زەکات ناکەوێتـە سـەریان، چونکـە زۆربـەی ماڵـەکانیـان لـە بازرگانیدایە(التجـارة).

## مەرجەکانی زەکاتی ماڵی بازرگانی

١- بگاتە ڕادەی زەکات (النصاب):-واتەنرخی ماڵە بازرگانییەکەی نـرخی (٢٠) مسقاڵ ئـاڵتوون بێت، ئەگـەر کەمتر بوو لە ڕادەی زەکات ئـەوە زەکاتی تێدا واجب نییە.

٢-سـاڵێکی کۆچی (هـجري) بەسـەر ماڵـەکەدا تێ پەڕیبێت.

٣-نیەتـی بـازرگانی هەبێت لـە ماڵەکەدا:واتە/کاتـێ بـوو بـە

خاوەنی ماڵەکە نیەتی ئەوەی لێ بێنێت کە بۆ بازرگانیەتی.

## چۆنێتی زەکات دان لە ماڵی بازرگانیدا

دەبێت ماڵی بازرگانیەکە بخەملێنرێت بە پارە بە مایە و قازانج و هەڵگیراو قەرزێک کە ئومێدی دانەوەی هەبێت، پاشان زەکاتەکەی بدات لە گەڵ ئەو ماڵەی کە هەیەتی لە پارەی دانراو، کە چل یەکە، واتە لە چل دیناردا یەک دینار یان لەچل هەزاردا یەک هەزار.

## ئایا زەکات لە ماڵی بازرگانیدا لە خودی ماڵەکە دەدەیت یان لە نرخەکەی (قیمەتەکەی)

زۆربەی زانایان بۆ ئەوە چوونە کە واجبە لە نرخی ئەو ماڵەی کە بۆ بازرگانییە زەکات بدرێت، وە دروست نییە زەکات لە خودی ماڵەکە بدرێت، بۆ نموونە/کەسێ دوکاندار بێت، زەکاتی دوکانەکەی لە شت و مەکی دوکانەکە بدات بە زەکات نەک پارەکەی(نرخەکەی)، ئەمە لای زۆربەی زانایان دروست نییە، بەڵام لای پێشەوا ئەبو حەنیفەو ووتەیەکی پێشەوا شافعی ئەوەیە کە بازرگان بە ویستی خۆیەتی کە نرخی ماڵەکە بدات یان خودی ماڵەکە بدات.

## زەکاتی دانەوێڵە و بەروبووم

خوای گەورە زەکاتی دانەوێڵە و بەروبوومی واجب کردووە وەکو فەرموویەتی:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَنفِقُوا۟ مِن طَيِّبَٰتِ مَا كَسَبْتُمْ وَمِمَّآ أَخْرَجْنَا لَكُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ ﴾ [البقرة ٢٦٧] **واتە**/ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، زەکاتی ئەوشتە پاکانەی کە بەدەستتان هێناوە بدەن وەئەوانەی لەزەوی بۆمان دەرکردوون، وە لە شوێنێکی تردا خوای گەورە فەرموویەتی:

﴿ وَءَاتُوا۟ حَقَّهُۥ يَوْمَ حَصَادِهِۦ ﴾ [الأنعام ١٤١] **واتە**/ ڕۆژی چنینەوەو دورینەکردن مافەکەی بدەن. ئیبن عەبباس فەرموویەتی:مافەکەی ئەو زەکاتەیە کە فەرزکراوە، هەروەها زانایان کۆکن لەسەر ئەوەی کە زەکات واجبە لە (گەنم-جۆ-خورما-مێوژ)، جگە لەم چوار بەروبوومە، زانایان جیاوازیان هەیە دەربارەیان کەئایا زەکاتیان تێدا واجبە یان نا؟ وەکو (زیتون -هەنگوین....هتد).

## ڕادەی زەکاتی دانەوێڵە

لای زۆربەی زانایان ڕادەی زەکاتی دانەوێڵەو بەرووبووم پێنچ ویسقە پاش پاکردنەوەی لە کاو توێکڵ، لەبەر فەرموودەکەی پێغەمبەری خوا(دروودی خوای لەسەر بێ)کەفەرموویەتی:

(لَيسَ فِيمَا دُونَ خَمسَةِ أَو سُقٍ صَدَقَة).[1] واتە/لە پێنج ویسق کەمتر لە دانەوێڵەو بەرووبوومدا زەکات نییە.

کەیەک ویسق=٦٠صاع، یەک صاعیش=٤ گوێل، یەک گوێلیش= ٥٤٤گرام، کەواتە یەک ویسق=٦٠×٤×٥٤٤= ١٣٠,٥٦٠کیلو گرام، وە پێنج ویسق=١٣٠,٥٦٠× ٥= ٦٥٢,٨کیلوگرام، کەواتە ڕادەی زەکاتی دانەوێڵە وبەرووبووم = ٦٥٢,٨کیلو گرام، بەڵام لای پێشەوا ئەبو حەنیفە زەکات واجبە

لە دانەوێڵەو بەرووبووم دا بەگشتی کەم بێت یان زۆر، لەبەر فەرموودەکەی پێغەمبەری خودا(دروودی خوای لەسەربێ) کە فەرموویەتی:

:(فِيمَا سَقَتِ السَّمَاء العُشرُ).[2] واتە//ئەوەی ئاسمان ئاوی دا دەیەکی زەکاتی لێدەدرێت.

ڕای پەسەند:-ڕای زۆربەی زانایانە کە ڕادەی زەکاتی دانەوێڵە وبەروبووم پێنج ویسقە، چونکە لە فەرموودەکەی تردا ڕادەکەی دیاری کراوە.

تێبینی// تنیەڕبوونی ساڵ بەسەر ماڵەکەدا لە زەکاتی دانەوێڵە و بەرووبووم، مەرج نییە دەبێ هەر لەڕۆژی دروێنەکردنی یان چنینەوەی زەکاتەکەی بدرێت، ئەگەر گەیشتە ڕادەی زەکات وەکو خوای گەورە فەرموویەتی:

﴿وَءَاتُوا حَقَّهُ يَوْمَ حَصَادِهِ﴾ [الأنعام ١٤١]

---

(١)أخرجه البخاري برقم(١٤٤٧) ومسلم (٩٧٩).
(٢)صحيح، أخرجه أحمد برقم (٢٢٠٣٧ ).

## بڕی زەکاتی واجب لە دانەوێڵە و بەروبوومدا

بڕی زەكـاتی دانـەوێڵە و بـەرووبـووم دەگۆڕدرێـت بەپێـی ئاودێـری كـردنی، ئـەگـەر ئـاسمـان ئاوی دا، واتە بەباران ئاودرا بەبێ ئامێرەكانـی ئـاودان ئـەوە دە یـەكی (١٠/١) زەكاتـی لێ ئەدرێت، بەڵام ئەگەر بە ئامێری ئـاودان ئـاودرا یـان بـە ووشـتر یـان بـە هـەر هۆكارێكی ئاودان كـە تێچوو (تكليـف) و ئـەزێتی تێدابێ، ئـەوە نـیو دەیەكی ( ٢٠/١ ) زەكاتی لێ ئـەدرێت، لەبەر فەرموودەكـەی پێغەمبـەری خودا(دروودی خـوای لەسـەر بێ) كە فـەرموويـەتی :

(فِيمَا سَقتِ الأَنهَارُ وَالعُيُون العَشرُ ومَا سُقِيَ بِالسَّوَانِي فَفِيهِ نِصفُ العُشرِ).[١]

واتـە/ ئـەوەی بـە ڕووبـار و كانيـاو ئـاودرا دەيـەكی زەكاتـی لەسـەرە، وە ئـەوەی بـە ووشـتر ئـاودرا ئـەوە نيـو دەيەكی لەسـەرە، واتـە ( ٢٠/١ )دا.

*تێبينی// ئـەگـەر كـەسێ زەكاتی دانەوێـڵە و بەرووبوومەكەی بەپـارە بـدات لـە جياتـی دانەوێڵـە و بەرووبوومەكـەی، ئـەوە دەبێـت بـە هـەمـان شێـوەی دانەوێڵەوە و بەرووبووم، دەيەكی زەكاتـی ماڵەكـەی بـدات، واتـە لـە دە(١٠)دينـار دينارێـك زەكات دەدات يـان لـە (١٠)هـەزار، هـەزار دينـار زەكات دەدات، نـەك وەك زەكاتـی پـارە و پـول حيسـابی بۆ بكات لـە چل دا يـەك بـدات، واتـە لـە چل هـەزار، هـەزار بـدات، چـونكە زەكاتـی دانەوێڵـەو بەرووبووم (دە يەكـە نـەك چـل يـەك).

---

(١)رواه أبو داود برقم (١٥٩٧) والنسائي (٢٤٨٩)،و صححه الألباني.

## زەکاتی زەیتوون

زانایـان جیـاوازیان هەیـە دەربـارەی زەکاتـی زەیتـوون، لای حەنەفییەکان و مالکییەکان و ووتەیەکی کۆنی پێشەوا شافعی و ووتەیەکی پێشـەوا ئەحمەدئەوەیە کە زەکات واجبە لە زەیتوندا، هەروەهـا لەئیبن عەباسیشـەوە ڕیوایـەت کراوە، لەبـەر گشـتێتی ووتـەی خـوای گـەورە کـە فەرموویەتـی:

﴿وَءَاتُـوا حَقَّـهُ يَـوْمَ حَصَـادِهِ﴾ [الأنعـام ١٤١] ڕۆژی چنینـەوەی مافەکـەی بـدەن، بـەڵام لای پێشـەوا شـافعی لـە ووتـەی تازەیداوەیەکێک لە ووتەکانی پێشـەوا ئەحمـەد، ئەوەیە کە زەکات لـە زەیتونـدا واجب نـییە، لەبەرئـەوەی بـە ووشـکی هەڵناگیرێت، هەروەهـا ئەمـە ڕای زانـای سـەردەم ئیبـن بازیشـە (ڕحمەتـی خـوای لـێ بێـت)، ڕای پەسـەند/ ئەوەیـە کـە زەکات لـە زەیتونـدا واجب نییـە.

## زەکاتی هەنگوین

زۆربـەی زانایـان بـۆ ئـەوە چـوون کـە هەنگوین زەکاتی تێدا نییە، لەوانـە پـێشـەوا شـافعی و مالیـک و ئیبـن مونـزر، لەبەرئـەوەی هیچ بەڵگەیەکی جیگر نەهاتووە لەسـەر واجبێتی زەکات لـە هەنگویندا، هەروەهـا پێشـەوا بوخاریش فەرموویەتی:هیـچ بەڵگەیەکـی تـەواو نەهاتـووە دەربـارەی زەکاتـی هـەنگوین، بـەڵام حەنەفییـەکان و پێشـەوا ئەحمـەد بـۆ ئـەوە چوونـە کـە هەنگویـن زەکاتـی تێـدا واجبـە، بەبەڵـگەی ئەو ڕیوایەتەی کـە عـەمری کـوڕی شوعەیب

گێڕایەتیوە لە پێغەمبەری خودا( دروودی خوای لەسەر بێ):

(أَنَّهُ أَخَذَ مِنَ العَسَلِ العُشْرُ).[1] واتە/ پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)لە هەنگوین دە یەکی وەرگرتووە، ڕای پەسەند/ئەوەیە کە زەکات لە هەنگویندا واجب نییە، چونکە ئەم ڕیوایەتە کە هاتووە دەربارەی زەکاتی هەنگوین لاوازە و ناکرێتە بەڵگە بۆ واجبێتی زەکات لە هەنگویندا، والله أعلم.

## پێش خستنی زەکات

دروستە زەکات پێش بخرێت پێش ئەوەی ساڵی بەسەردا تێ پەڕێ، لای زۆربەی زانایان لەوانەپێشەوا شافعی و ئەبو حەنیفەو ئەحمەد، بەڵام لای پێشەوا مالیک دروست نییە پێش خستنی زەکات، چونکە یەکێک لە مەرجەکانی زەکات تێ پەڕبوونی ساڵە بەسەر ماڵەکەدا، ڕای پەسەند/ ئەوەیە کەدروستە پێش خستنی زەکات.

## دواخستنی زەکات

دروست نییە زەکات دوابخرێت لەکاتی خۆی، مەگەر بۆ پێویستی یان بەرژەوەندیەک بێ، وەکو ئەوەی کە دوابخرێ بۆ هەژارێک کە ئامادەنییە لەو کاتەدا کە زۆر پێویستێتی، لەو هەژارانەی تر کە ئامادەن لەوێدا هەژارترە، یان دوابخرێ بۆ کەسێکی هەژاری خزمی خۆی، چونکە خزم مافی زیاترە

(١)ضَعيف، أخرجه إبن ماجه برقم (١٨٢٤).

لەسەری لە کەسانی تر، بەڵام دەبێت دواخستنەکە زۆر نەبێت.

## ئەوانەی زەکاتیان پێ دەدرێت

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ إِنَّمَا الصَّدَقَٰتُ لِلْفُقَرَاءِ وَالْمَسَٰكِينِ وَالْعَٰمِلِينَ عَلَيْهَا وَالْمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمْ وَفِي الرِّقَابِ وَالْغَٰرِمِينَ وَفِي سَبِيلِ اللَّهِ وَابْنِ السَّبِيلِ ﴾[التوبة ٦٠]

کەواتەئەوانەی زەکاتیان پێ دەشێ هەشت جۆرن:-

١-هەژارەکان(الفقراء):-ئەو کەسانەن کە هیچیان نییە لە ماڵ و کاسبی.

٢-کەم دەست(مساکین):-ئەو کەسانەن کە شتێ کەمیان لەماڵ هەیە، بەڵام بەشی بژێوی ژیانیان ناکات.

٣-ئەوانەی کە زەکات کۆدەکەنەوە(العاملین علیها):-واتە ئەو کرێکارانەی کە بۆ کۆکردنەوەی زەکات دانراون، ئەگەر دەوڵەمەندیش بن.

٤-دڵ ڕاهێنراوەکان(الْمُؤَلَّفة قلوبهم):-ئەو کەسانەن کە دڵیان جێگیر نەبووە لەسەر ئیسلام، زەکاتیان پێ دەدرێت بۆ ئەوەی دڵیان جێگیر بێ لەسەر ئیسلام.

٥-بەندەکان:(الرقاب):-زەکات دەدرێت بەو بەندانەی کە دەیانەوێت خۆیان ڕزگار بکەن لەبەندایەتی و کۆیلایەتی، وە ووشەی(الرقاب) گشتی یە هەموو بەندەیەک دەگرێتەوە.

٦-قەرزداران:(الغـارمين):-ئەو كەسانەی كەتوشی قـەرز بوونـەوە ناتوانن بيدەنـەوە، دروستە زەكاتيان پێ بدرێت بۆ ئەوەی قەرزەكانيان بدەنەوە، بە مەرجێك لـە ڕێگای شـەرعيدا قـەرزار بووبێت بەبێ زيادەڕەوەی، نـەك لـە ڕێگای ناشـەرعيدا قـەرزار بووبێت، ئەگەر لەڕێگەی ناشـەرعيدا قەرزار بـووبێت، بـە مەرجێ دروستە زەكاتی پێ بدرێت كە پەشيمان بووبێتەوە و تەوبـەی كردبێـت لـەو كـارەی، وە جارێكی تـر نەگەڕێتەوە سـەری.

٧-لـەڕێگـەی خـوادا:(وفی سبـيل الله):-ئـەو كـەسانەی لـە پێناو خـوادا دەجـەنگـن بۆ سـەر خستنی ئاينی خودا دروستە زەكاتيـان پێ بدرێت، ئەگـەر دەوڵـەمـەنديـش بـن، بـەڵام ئـەو جـەنگاوەرانە دەگـرێتەوە كـە مووچـەی تايبەتـيان نييـە لـە دەوڵەتـەوە، ئەمـەش ڕای زۆربـەی زانايانـە، بەڵام لای هـەنـدێ لـە زانـايان لـەپێناو خـوادا هەمـوو ڕێگەيـەك دەگرێتـەوە كە مرۆڤ بگـەيەنێتە ڕەزامەنـدی خـوای گـەورە، جـا فێربوونـی زانسـتی شـەرعی بێت يـان هـەر هۆكـارێكی تـر بێت بۆ بڵاوبوونـەوەی ئاينی ئيسـلام، هەروهـا لای هەندێ لـە زانايانيش حـەج كردنيش دەگرێتـەوە، بـەڵام لای زۆربـەی زانايـان لـە پێنـاو خـوادا تەنهـا تێكۆشـان(جيهاد) دەگرێتـەوە، چونكـە ئەگـەر بـە شـێوەيەكی گشـتی لێـك بـدرێتەوە زۆر شـت دەكەونـە ژێـر ووشـەی(وفی سبيل الله) وە، هەركەسێ هـەڵـدەستێ و بانگەشـەی ئەوە دەكات كە ئـەو كارەی ئەم ئەنجامی دەدات لە پێناوخوای گەورە دايە.

٨-ڕێبوار:(ابـن سـبیل):-ڕێبوارێک کـە لـە وەڵاتـی خـۆی دائەبڕێت و پـارەو پولـی پـێ نامێنێت، دروسـتە زەکاتـی پـێ بدرێت، ئەوەندەی کە یارمەتی بدرێت بـۆ جـێ بەجـێ کردنی مەبەستەکانی و گەڕانەوەی بۆ وەڵاتی خۆی، بەڵام لای زۆربـەی زانایـان ئەو ڕێبوارەی کە لە ناو وەڵاتی خۆیدایە و کەسێکی دەس دەکەوێت کـە قـەرزی بـداتێ دروسـت نییـە زەکاتـی پـێ بدرێت، هـەر چەندە لای پێشـەوا شـافعی دروستە زەکاتی پێ بدرێت با لە وەڵاتی خۆیشدا بێت، بە مەرجێ گەشتێ(سـەفەرێ) نەبێت بۆ ئەنجام دانی تـاوان بێت.

## چەنـد تێبینییـەك دەربـارەی زەكات بەشـێوەیەكی گشـتی

١- زانایـان کـۆکن لەسـەر ئـەوەی کـە پیـاو نابێـت زەکاتـی ماڵەکەی بدات، بە خێزانـی خـۆی، چونکە نەفەقـەی ژن لەسـەر پیاو واجبە و دەبێت نەفەقـەی دابیـن کات.

٢-لای پێشـەوا شـافعی و ووتەیەکی پێشەوا ئەحمەد دروستە ژن زەکاتی ماڵەکـەی خـۆی بـدات بەپیاوەکەی، ئەگەر پیاوەکەی هـەژار بێت، چونکە نەفەقەی پیاو لەسـەر ژن نییە.

٣-لای زۆربـەی زانایـان دروسـت نییـە کەسـێ زەکـات بـە بـاو باپیرانـی و دایـک و داپیرانـی و نـەوەکـانی و کچـەکانی و کـوڕەزاکانی و کچـەزاکانی بـدات، چونکـە نەفەقـەی ئەمانـەی هەمـوو لەسـەر واجبـە.

٤-دروسـت نیـە زەکـات بدرێـت بـە بێ باوەڕ(کافر)، بە تێکڕای زانایان.

٥-لای زۆربەی زانایان دروست نییە زەکات بدرێت بە کەسی تاوانبار و بیدەعەچی(موبتەدیع) ئەگەر زانرا لە کاری ناشەرعیدا خەرجی دەکات.

٦-دروست نییە زەکات بدرێ بەکەسی دەوڵەمەند و وە کەسێ توانای کاسبی هەبێت، وەکو پێغەمبەری خودا(دروودی خوای لەسەر بێ)کە فەرموویەتی: (لاَ حَظَّ فِهَا لِغَنِيٍّ وَلاَ لِقَوِيٍّ مُكتَسِبٍ).[1]

واتە/بەش لە زەکاتدا نییە بۆ دەوڵەمەند و کەسێک توانای کاسبی کردنی هەبێت، بەڵام دەوڵەمەند دروستە زەکاتیان پێ بدرێت لەبەر هۆکارێکی تر نەک لەبەر دەوڵەمەندی وەکو باسمان کرد ئەوانەی کە لە پێناو خوادا دەجەنگن یان ئەوانەی زەکات کۆدەکەنەوە دروستە زەکاتیان پێ بدرێت با دەوڵەمەندیش بن.

٧-دروست نییە زەکات بدرێت بەبەنو هاشم کە بنەماڵەی عەلی و عوقەیل و جەعفەر و عەباس و حارث و بنەماڵەی موتەلیب دەگرێتەوە، چونکە کەس و کاری پێغەمبەری خودان (دروودی خوای لەسەر بێ) وەکو پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێ) خۆی فەرموویەتی: (إنَّ الصَدَقَةَ لاَ تَحِلُّ لِمُحَمَّدٍ وَلاَلِ مُحَمَّد).[2]

واتە/ بەڕاستی زەکات حەڵاڵ نییە بۆ موحەمەد و کەس و کاری موحەمەد(دروودی خوای لەسەر بێ).

---

(١)رواه أبو داود برقم (١٦٣٣) والنسائي (٢٥٩٨) وأحمد (١٧٩٧٢), وصححه الألباني.
(٢)أخرجه مسلم برقم (١٠٧٢) والنسائى(٢٦٠٩) وأبوداود (٢٩٨٥).

٨-گواستنەوەی زەکات لە شارێکەوە بۆ شارێکی تر، بە مەرجێ دروستە خەڵکی ئەوە شارە بێ پێویست بن لە زەکات، یان خەڵکی شارەکانی تر زۆر هەژار تربن لە خەڵکی شارەکەی خۆی، یان هەر بەرژەوەندییەکی تر بێت.

## زەکاتی سەر فیترە(زکاه الفطر)

زەکاتی سەر فیترە دەبێتە هۆی پاک کەرەوەی کەم و کورییەکانی ڕۆژووان لە قسەی خراپ و کاری خراپ، وەدەبێتە خۆراک بۆ هەژران وەکو پێغەمبەری خوا(درووی خوای لەسەر بێ)فەرموویەتی: (طُهرَةَ للِصَّائِم مِن اللَّغوِ وَالرَّفَثِ وَ طُعمَةُ لِلمسَاكِين).[1]

واتە/ زەکاتی سەر فیترە پاکەرەوەیە لە قسەی هیچ و خراپ، وە خواردنێکیشە بۆ کەم دەستان.

## حوکمی زەکاتی فیتر

زەکاتی فیتر واجبە لە سەر هەموو موسڵمانێک گەورەبێت یان بچووک، نێر بێت یان مێ، ئازاد بێ یان بەندە، هەر وەکو ئیبن عومەر گێڕایەتییەوە فەرموویەتی:

(فَرَضَ رَسُولُ (صلى الله عليه وسلم) زَكَاةِ الفِطرِ صَاعاً مِن تَمرٍ أَوصَاعاً مِن شَعِيرٍ عَلَى العَبدِ وَالحُرِّ وَالذَّكَرِ وَالأُنثى وَالصَّغِيرِ وَ الكَبِيرِ مِن المُسلِمِينَ).[2]

(١)أخرجه أبو دواود برقم (١٦٠٩),وصححه الألباني.
(٢)أخرجه البخاري برقم (١٥٠٣).

صاعێک= (٢,٢٠٠)کیلۆگرام بە نزیکەی (تقریبا) واتە/ پێغەمبەری خودا (دروودی خوای لەسەر بێ) زەکاتی فیتری فەرزکرد صاعێک لە خورما یان صاعێک لە جۆ لەسەر بەندە و ئازاد و نێر و مێ و گەورە بچووک لە موسڵمانان. بە مەرجێک خۆراکی شەو ڕۆژێکی خۆی و ئەو کەسانەی هەبێت کە تێچوویان لەسەریێتی-نەفەقەیان لەسەر یێتی ئەگەر نا زەکاتی فیتر لەسەری واجب نابێت.

## زەکاتی فیترچ کات واجب دەبێت

لای حەنەفییەکان و ووتەیەک لای پێشەوا مالیک لە کاتی دەرکەوتنی شەبەقی(فجر) ڕۆژی جەژن واجب دەبێت، بەڵام لای هەندێ زانایانی تر لەکاتی خۆرئاوابوونی کۆتا ڕۆژی ڕەمەزان(رمضان)واجب دەبێت، وەکو شافعییەکان و حەنابلەکان.

کەواتە:زەکاتی فیتر واجبە دەربکرێت پێش نوێژی جەژن، وە قەدەغەیە (حرام) دوابخرێت بۆ دوای نوێژی جەژن، وە دروستیشە زەکاتی فیتر پێش بخرێت بۆ ڕۆژێک یان دوو ڕۆژپێش جەژن، لەبەر فەرموودەکەی ئیبن عومەر کە فەرموویەتی:

(كَانوُا يُعطُونَ صَدَقَةَ الفِطرِ قَبلَ العِيدِ بِيَومٍ أَو يَومَين).[1] واتە/ هاوەڵان زەکاتی فیتریان دەدا بە ڕۆژێک یان دوو ڕۆژ پێش جەژن.

(١)أخرجه البخاري برقم (١٥١١).

## ئەو جۆرە خۆراکانەی کە دەدرێت بە زەکاتی فیتر (الفِطـر)

ئـەو خـۆراکانـەی کـە لـە فەرموودەکـاندا هاتـووە بریتییـە لە(گەنم-جۆ-خورما-کـەشک-مێوژ) بـەڵام ڕای پەسـەند ئەوەیـە کـە خۆراکی سـەرەکی هـەر میللەتێـک چییـە دەتوانرێت ئـەوە بدرێت بـە زەکاتـی فیتر، وەکـو ئـەم سـەردەمـەی خـۆمـان کـە برنـج خـۆراکـی سـەرەکـی خـەڵـکـە.

* تێبینی *//

زانایـان کـۆکـن لەسـەر ئـەوەی ئـەگـەر کـەسێ پـێش چـەژن زەکاتی فیتری دەر نەکرد، واجبە لەسـەری داوای نوێژی جەژن ئەنجامـی بدات، چونکـە بـەنەمانی کاتەکـەی لەسـەری لا ناچێت، وە بـە دواخسـتنی تـاوان بـار دەبێـت و پـێویسـتی بـە پەشـیمان بوونەوەیە(تەوبەکردن)ە، چونکـە واجبێکـی ئـەنجام نـەداوە لـە کاتـی خـۆیدا.

## ئایا دروستە زەکاتی ( فیتر) بە پارە دەر بکرێت

سـەبارەت بـە دەرکردنـی پـارە لـە جیاتـی خـودی شـتەکە لـە کاتـی زەکات داندا، زانایـان جیاوازیان هەیـە کـە ئایا دروسـتە یـان نـا؟

لای زۆربـەی زانایـان، وەکـو حـەنابیلەکان و شـافعییەکان ومالکییـەکان دروسـت نییـە پـارە بدرێـت لـە جیاتـی خـودی

شتەکەچونکە لەفەرموودەکاندا وا هاتووە، بەڵام لای پێشەوا ئەبو حەنیفە دروستە پارە بدرێت لە جیاتی خودیماڵەکە، چ زەکاتی فیتر بێ یان نەزر بێ یان کە فارەت بێت، هەروەها ئیبن تەیمیەش ڕای وایە کە بۆ کاتی پێویست دروستە پارە بدرێت لە جیاتی خودی شتەکە.



## بابەتەکانی ئەم بەشە

یەکێکی تر لەپایەکانی ئیسلام ڕۆژوو گرتنە، کە بەواتای خۆگرتنەوە لە خواردن و خواردنەوەیە لە هەموو ئەو شتانەی کە ڕۆژوویان پێ بە تاڵ دەبێتەوە یان دەشکێت لە دەرکەوتنی شەبەقەوە- فەجرەوە هەتا خۆر ئاوابوون لە گەڵ نیەت هێناندا.

## حوکمی ڕۆژووی مانگی ڕەمزان

ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان فەرزە لەسەر هەموو موسڵمانێکی پێ گەیشتووی ژیری لەش ساغی نیشتە جێ(موقیم) واتە گەشتیار (موسافر)نەبێت، هەر وەکو خوای گەورە فەرموویەتی:

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ كُتِبَ عَلَيْكُمُ ٱلصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ﴾ [البقرة ١٨٣]

**واتە/**ئەو کەسانەی کە باوەڕتان هێناوە ڕۆژووتان لەسەر فەرز کراوە وەکو چۆن لەسەرئەوانەی پێش ئێوەنوسراوە، بەڵکولەخوا بترسن وخۆتان بپارێزن.

هەروەها فەرموویەتی:

﴿فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ ٱلشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ﴾ [البقرة ١٨٥] **واتە/** هەر کەس لە ئێوە مانگی ڕەمەزانی بینی و پێی گەشت با ئەو مانگە بەڕۆژوو بێت، یان لەبەر فەرموودەکەی پێغەمبەری خوا(درووی خوای لەسەر بێ) کاتێ دەشتەکییەک هات بۆ لای، فەرمووی هەواڵم بەرێ خوای گەورە چی فەرز کردووە

لەسەرم لە ڕۆژوو، پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرمووی:

(شَهرَ رَمَضَانَ إلا أَن تَطَوَّع شَيئاً).[1] واتە/ مانگی ڕەمەزان مەگەر خۆت شتێ لە ڕۆژووی سونەت ئەنجام بدەیت.

## بەچی ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان واجب دەبێت

١-بە بینینی یەکەم شەوی(هیلال) مانگی رەمەزان، هەر وەکو خوای گەورە فەرموویەتی:

﴿ فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ الشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ ﴾ [البقرة ١٨٥] واتە/هەر کەسێکتان مانگی ڕەمەزانی بەسەرهات وە ڕێبوار و نەخۆش نەبوو، بیانوی شەرعیشی نەبوو، دەبێ بە ڕۆژوو بێت.

٢-بە تەواو کردنی سی ڕۆژی مانگی شەعبان لەبەر ئەوەی مانگی کۆچی کەمتر نییە لە بیست و نۆ ڕۆژ وە زیاتر نییە لە سی ڕۆژ، ئەگەر مانگی یەک شەوەی ڕەمەزان نەبینرا، لەبەر ئەوەی ئاسمان هەور بوو یان هەر هۆکارێکی تر ئەوە دەبێت مانگی شەعبان تەواو بکرێت بە سێ ڕۆژ لەبەر فەرموودەکەی پێغەمبەری خودا(درودی خوای لەسەر بێ) کە فەرموویەتی:

(فَإن غُمَّ عَلَيكُم فَاقدُرُوا له).[2] واتە/ ئەگەر هەور بوو ئەندازەی شەعبان بکەنە سی ڕۆژ.وە لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە کەپێغەمبەری خودا(درووودی خوای لەسەر بێ)فەرموویەتی:

---

(١)أخرجه البخاري برقم (٤٦) والمسلم (١١).

(٢)أخرجه البخاري برقم (١٩٠٠) والمسلم (١٠٨٠).

(صُومُوا لِرُؤيَتِهِ وَ أَفطِرُوا لِرُؤيَتِهِ، فَأَن غُمَّ عَلَيكُم فَأَكمِلوا عِدَّة شَعبَان ثَلاثِينَ يَوماً).[1] واتــە/ بـەبینینی مـانگ بـە ڕۆژووبن و بـەبینینی بیشکێنن، وە ئـەگەر هـەور بوو مانگی شـەعبان بکەنـە سی ڕۆژی تـەواو، پاشـان بـە ڕۆژوو بـن.

## بینینی مانگی ڕەمەزان بە چەند شایەت جێگر(ثابت) دەبێت

زۆربـەی زانایـان لەسـەر ئـەوەن کەشـایەتی یـەک پیـاوی دادپەروەر(عـادل) وەر ئـەگیرێت بۆبـەڕۆژوو بـوون، ئـەمەش وتـەی پێشـەوا ئەبوو حەنیفە وشافعی و ئەحمـەدە، وەپـێشەوا نـەوەوی فەرمووبەتـی ئەمیـان ڕاسترە یـان بـە هـێزترە، بـەڵام لای پێشـەوا مـالیک و لەیث و ئەوزاعـی و ثـەوری مەرجـە دوو شایەتی ڕاستگۆ شایـەتی بدەن، بەڵام بۆ بینینی هیلالی مانگی شـەوال زانایـان کۆکن کـە یـەک شـایەت بـەس نییـە، وە مەرجـە دوو شـایەتی ڕاستگۆ شـایەتی بدەن کە هیلالی مانگی شـەوالیان بینیوە و مانگی ڕەمەزان کۆتای هاتووە، هەر چەندە پێشـەوائـیبن حـەزم هـەروەها شـەوکانی و ئـیبنو ڕوشد دەفـەرموون یـەک شـایەت بـەسە.

## ئەگەر هیلالی مانگی ڕەمەزان لە وەڵاتێك بینرائایا پێویستە هەموو وەڵاتان بەڕۆژوو بن

ڕای یـەکـەم:-ئـەگـەر مـانـگ بـینرا لـە وەڵاتێک پێویستـە هـەموو

(١)رواه البخاري برقم (١٩٠٩) والمسلم (١٠٨١).

وەڵاتـان بەڕۆژووبـن، بەبـێ گوێدانـە جیـاوازی شـوێنی هەڵهاتنی مانگ، ئەمـەش بۆچـوونی حەنەفییـەکان و مالکییـەکان و هەندێ لـە شـافعییەکانە و ووتـەی بـاوی حـەنبەلیکانیشە، لەبەر فەرموودەکـەی پێغەمبـەری خـودا(دروودی خـوای لەسـەر بێت) کـە فەرموویەتـی: (إذا رأيتمـوُهُ فصومُـوا)، واتـە ئەگـەر مانگتـان بینی بـەڕۆژو بن، ئەمـەش گشـتییە و بـۆ هەمـوو موسـڵمانێکە.

ڕای دووەم:- بـۆ هـەر وەڵاتێـک بـینینی تایبەتی خۆی هەیە، واتـە هـەر وەڵاتـەو بەپێـی بینـینی خۆی کار دەکات، وە بینینی وەڵاتـی تـر بەسەرئەمانـدا ناچەسپێـت، ئـەم ڕایـەش ئیـبن مونـزیر نـەقڵی کردووەلـە عیکریمـە وقاسمی کوڕی موحەمەد و سـالم و ئیسـحاق، بـە بەڵگـەی فەرمـوودەی خـوای گـەورە کـە فەرموویەتـی :

﴿فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ الشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ﴾ [البقرة ١٨٥]

واتـە/هـەر کەسـێ لـە ئێوە هاتنی مانگی ڕەمەزانی بینی و پێی گەیشت بـا ئـەو مانگە بەڕۆژوو بێت.

ئـەم ئـایەتە ئـەوەی لێ دەخوێنرێتەوە ئـەوەی مانگی ڕەمەزانی نەبینی بە ڕۆژوو نابێت هـەتا مـانگ ئەبینێت یان مـانگی شـەعبان تـەواو دەکات بە تەواوەتی، واتە سی ڕۆژی تەواو.

ڕای سێ یەم:-ئەگـەر مـانگ بـینرا لە وەڵاتێک واجب دەبێت لەسـەر ئـەو وەڵاتانـەشی کـە نزیکـە لـەم وەڵاتـەوە کـە مانگی تێدا بینـراوە، وە هەڵهاتنـی مانـگ جیـاواز نییەتییانـدا، ئـەمەش ڕای مـام ناوەنـدە لـەم بـوارەدا وە بۆچوونـی پەسـەندی لای

شافعی و هەندێ لە مالکییەکان و حەنەفییەکان و وتەیەکی حەنابیلەکانە، وە هەڵبژاردەی ئیبن تەیمیەشە.

## مەرجی تەواوێتی ڕۆژوو

١- پاکێتییە لە حەیز و نیفاس : کە ئەمە تایبەتە بە ئافرەتانەوە، حەیز:خوێنی مانگانەی ئافرەتە کە تووشی دەبێت وە پێی دەوترێت سوڕی مانگانە(عادە)، وەنیفاسیش خوێنی دوای منداڵ بوونی ئافرەتانە.

٢-نییەت هێنان: ڕۆژوو پەرستنە وە دانامەزرێت مەگەر(ئیلا) بە نیەت هێنان نەبێت، هەر وەکو هەموو پەرستنەکانی تر(عیبادات)، بە بەڵگەی فەرموودەکەی پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێ)کە فەرموویەتی:

(إِنَّمَا الأَعمَالُ بِالنِّيَّات).[1] واتە/ وەرگرتنی کردەوەکان لەلای خوای گەورە بە پێی نییەتەکانە، هەر وەها پێشەوا نەوەوی فەرموویەتی:

(لايصح الصوم إلا بنية). واتە/ ڕۆژوو تەواو نییە و دانامەزرێت مەگەر بەنییەت هینان نەبێت، وە شوێنەکەشی دڵە، چونکە هەندێ جار خەڵکی خۆی لە خواردن دەگرێتەوە لەبەر نەخۆشی یان بۆ خۆ لاواز کردن یان ئارەزووی(ئیشتهایی)نیە لە خواردن یان بۆ هەر هۆکارێکی تر.

(١)أخرجه البخاري برقم (١)والمسلم (١٩٠٧).

## تازەکردنـەوەی نییـەت لـە هەمـوو شـەوەکانی ڕەمەزانـدا

واجبـە تازەکـردنەوەی نییـەت لـە هەمـوو شـەوەکانی ڕە مەزاندا لای زۆربەی زانایـان، لەبـەر ئـەوەی هـەر ڕۆژێک لە ڕۆژەکانـی ڕەمـەزان پەرستشێکی(عیبادەتێکی)سـەر بەخۆیـە ونەبەسـتراونەتەوە بـە یەکـەوە، بـەڵام لای پێشـەوا مـالک و ڕیوایـەتێک لـە پێشـەوا ئەحمـەدەوە ئەوەیە کە کافیە نیەت هێنان لەسـەرەتای مـانگی ڕەمەزانـەوە بۆ هەمـوو مانگەکە، هەر چەندە هەستان بۆ پارشێو و خـواردن و خواردنـەوە لەو کاتـەدا ئەمـە بـۆ خـۆی نییەتـە و مەبەسـتی لـە ڕۆژوو گرتنـە.

## پایەی ڕۆژووگرتن (ركن الصيام)

پایـەی ڕۆژووگرتـن خـۆ گردنـەوەیە لـە خـواردن و خواردنـەوە و ئـەو شتانەی کـە ڕۆژوو دەشـکێنێت لـە دەر کـەوتنی شـەبەقەوە( فەجرەوە)هەتـا خۆرئاوابـوون، لەبـەر فەرموودەکـەی خـوای گـەورە کـە فەرموویەتـی:

﴿وَكُلُوا وَاشْرَبُوا حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكُمُ الْخَيْطُ الْأَبْيَضُ مِنَ الْخَيْطِ الْأَسْوَدِ مِنَ الْفَجْرِ ثُمَّ أَتِمُّوا الصِّيَامَ إِلَى اللَّيْلِ﴾ [البقرة ١٨٧]

واتـە/ بخۆن و بـخۆنەوە هـەتا وەکو هێڵی سپی (ڕووناکی ڕۆژ) لە هـێڵی ڕەشی شـەو(تاریکی شـەوە )جـیادەبێتەوە لـە شـەبەقدا، پـاشان بـەردەوام بەڕۆژووبن تاوەکو سـەرەتایی شـەو.

## ئەوشـتانەی ڕۆژوو پوچـەڵ دەكەنـەوە (المبطـلات الصيـام)

١-خـواردن و خواردنـەوە بـە ئەنقەست:-ئـەگەر کەسێک خـواردن یان خـواردنەوەی خـوارد بـە لەبیر چوونـەوە، ئـەوە ڕۆژۆکەی تـەواوەو گـرتنەوەی لەسەر نییە، لەبەر فەرموودەکەی ئەبی هورەیرە کە پێغەمبەری خـوا(درووودی خوای لەسـەر بێ) فەرموویەتی:

(مَن نَسِيَ وَهُوَ صَائِم فَأَكَلَ أو شَرِبَ، فَليُتِمَّ صَومَه فإنَّمَا أَطعَمَهُ اللهُ وَسَقَاه).[1] واتــە/ هـەر کەسێ بـەڕۆژوو بـوو لـە بیری نەبـوو خـواردن و خواردنـەوەی خـوارد، با ڕۆژۆکـەی تـەواو بکـات، چونکـە ئەوە(خـوای گـەورە) خـواردن و خواردنـەوەی پێداوە. هـەروەهـا دەرزی مـوغەزی شـوێنی خـواردن و خـواردنەوە دەگرێتـەوە بۆیـە ڕۆژوو دەشکێنێـت، وە دەبێت ئـەو ڕۆژە بگرێتـەوە لـە کاتێکی تـردا.

٢-خـۆڕشاندنەوە:- ئەگـەر کەسێک ڕشانەوە زۆری بۆ هێنا و ڕشـایەوە، ئـەوە نەگێڕانـەوەی لەسـەرە نـە کەفـارەت، بـەڵام ئەگـەر بـە ئەنقەسـت خـۆی ڕشـاندەوە ئـەو دەبێـت ڕۆژۆکـەی بگرێتـەوە، هـەر وەکو پێغەمبـەری خوا (درووودی خـوای لـەسـەر بـێ) فەرموویەتـی: (مَن ذَرَعَهُ القَيءُ فَلَيسَ عَلَيهِ قَضَاءٌ، وَمَن استَقَاء عَمَداً فَليقضِ).[2]

---

(١)أخرجه البخاري برقم (١٩٣٣) ومسلم (١١٥٥).

(٢)أخرجه أبو داود (٢٣٨٠) وترمذي (٧٢٠) وابن ماجه (١٦٧٦) وأحمد (١٠٤٦٣) وغيرهما وصححه الألباني.

هەروەها ئیبن مونزیر کۆی (ئیجماعی) زانایان نەقڵ دەکات لەسەر بەتاڵ بوونەوەی ڕۆژوو بە خۆ ڕشاندنەوەی ئەنقەست.

٣-خوێنی سوری مانگانە(عادە) و خوێنی منداڵ بوون:- هەر ئافرەتێک توشی خوێنی مانگانە یان خوێنی منداڵ بوون بوو، ئەگەر چی لە کۆتای ڕۆژیشدا بێت و چەند کاتێکی کەمی مابێت ڕۆژۆکەی پوچەڵ دەبێتەوە و دەبێت ڕۆژۆکەی بگرێتەوە بە تێکڕای زانایان.

٤-ئاو هێنانەوە:- هەر کەسێ ئاوی خۆی هێنایەوە بە هۆی ماچ کردنی خێزانی بێت یان بەهۆی یاری کردن بێت لە گەڵیدا، یان بەدەست بێت، ئەوە ڕۆژۆکەی پێ دەشکێت، وە دەبێت ڕۆژۆکەی بگێرێتەوە بە ڕای زۆربەی زانایان، بەلام لای ئیبن حەزم و پێشەوا ئەلبانی ئاو هاتنەوە بەبێ جیماع ڕۆژوو ناشکێنێت، ڕای پەسەند ئەوەیە کە ڕۆژوو دەشکێنێت بە ڕای زۆربەی زانایان، لەبەر فەرموودەی خوای گەورە کە لە فەرموودەیەکی قودسیدا دەربارەی ڕۆژووان دەفەرموێت:

(يَدَعُ طَعَامُهُ وَشَرَابُهُ و شَهوَتَهُ مِن أجلي).[1] واتە/خواردن و خواردنەوە و ئارەزوو وشەهەواتی واز لێ هێناوە لەبەر خاتری من.

٥-نییەت هێنانی شکاندنی ڕۆژوو:- هەر کەسێ نییەتی شکاندنی ڕۆژووی هەبێت، لە کاتێکدا کە بە ڕۆژووە ئەو کەسە ڕۆژۆکەی دەشکێت، با هیچیش نەخوات، چونکە نییەت هێنان مەرجێکە بۆ تەواویتی ڕۆژوو، جا ئەگەر کەسەکە نییەتەکەی



(١)أخرجه البخاري برقم (١٨٩٤) وأحمد (٩١١٢).

هەڵوەشاندەوە بە مەبەستی ڕۆژوو شكاندن بە ئەنقەست ڕۆژۆكەی بەتاڵ دەبێتەوە.

٦-جووت بوون(جیماع كردن):- هەر كەسێ جیماع بكات لە گەڵ خێزانیدا لە ڕۆژانی ڕەمەزاندا ئەوە ڕۆژۆكەی دەشكێت، وە دەبێت بیگێڕێتەوە و كەفارەتیش بدات، كە ئازاد كردنی بەندەیەكە، گەر نەبوو دوو مانگ لەسەریەك بە ڕۆژوو دەبێت، ئەگەر نەیتوانی دەبێت خواردنی شەست هەژاربدات، وە لای زۆربەی زانایان ئافرەتەكەش دەبێت ڕۆژۆكەیبگێڕێتەوەو كەفارەتیش بدات بە مەرجێ ئافرەتەكە ڕازی بووبێت لەسەر ئەو كارە، بەڵام ئەگەر لە لایەن پیاوەكەوە زۆری لێ كرابێت ئەوە كەفارەتی ناكەوێتە سەر بەس پیاوەكە كەفارەت دەدات، هەر چەندە لای هەندێ لە زانایان ئافرەتەكە لە هیچ كاتێكدا كەفارەت ناكەوێتە سەری گەر بە ڕەزامەندی خۆی بێت یان بە زۆربێت، یەكێك لەوانە پێشەوا نەوەوییە

## ئەو شتانەی كە ڕۆژوو ناشكێنێت

١-خۆشۆردن و مەلە كردن: بەڵام دەبێت ئاگاداری چوونە خوارەوەی ئاو بین لە گەرودا.

٢-ئاو لەدەم و لووت وەردان: بەڵام بەبێ زیادە ڕەوی.

٣- تام كردنی خواردن بۆ كابانی ماڵ: بەڵام دەبێت ئاگاداری ئەوە بێت كە نەچێتە خوارەوە.

٤-لـەش گرانـی: کەسـێک تووشـی لـەش گرانی بووخۆشـۆردنەکەی بکاتـە دوای فەجـرەوە دروسـتە، هەروەهـا کەسـێک تووشـی لـەش گرانـی بـوو لـە ڕۆژدا بـە هـۆی خـەو بینینـەوە ڕۆژۆکـەی دروسـتە و بەتـاڵ نابێتـەوە.

٥-مـاچ کردنـی خێـزان و نزیـک بوونـەوە لـێ: بـەڵام دەبێت توانـای خۆڕاگرتنـی هەبێـت و تووشـی جـووت بوون(جیمـاع) نەبێـت.

٦-کەڵـە شاخ گرتن و خوێن بەخشین بۆ کەسێ کـە تووشی لاوازی(ضُعـف) نەبێـت، هـەر چەنـدە لای هەنـدێ لـە زانایـان کەڵەشـاخ گرتـن ڕۆژوو بـەتاڵ دەکاتـەوە، بـەڵام لای زۆربـەی زانایـان ڕۆژوو بەتـاڵ ناکاتـەوە.

٧-چـاو ڕشـتن و قەترە کردنە چـاو و گوێ و بۆن کردنی بۆن و دەرزی لێدان، بـەڵام دەبێـت دەرزی مـوغـەزی نەبێت(چونکـە دەرزی موغـەزی ئـاو و کانـزاو و پێداویسـتـییەکانی لەشـی مرۆڤـی تێدایـە لـە جیاتـی خـواردن بـەکاردێ)، بۆیـە ڕۆژوو دەشـکێنێت.

٨-سـیـواک کردن:بەڵام لای شـافعییەکان و حەنابیلـەکان پێیان باشـە دوای نیوەڕۆ سیواک بـەکار نەهێنرێت، هەروەهـا مەعجون ددان هەمـان حوکمـی هەیـە.

٩-بـەڵغـەم (تفکـە) قـوت دان و تـف قـودان، بـەڵام باشـتر وایـە ئەگـەر بەڵغـەم هاتـە نـاو دەم قـوت نەدرێـت و فـڕێ بدرێتـەوە.

١٠-تەحامیل (شاف) هەڵگرتن و بەنج کردن، بەڵام نابێت لە کاتی بەنج کردنی دان و هەڵکێشانی خوێن قوت بدرێت.

## ڕۆژووە سونەتەکان

١-شەشەڵان:واتە شەش ڕۆژ لە مانگی شەوال.

٢-نۆ و دەی عاشوراء (مانگی موحەڕەم).

٣-ڕۆژی عەرەفە:واتە نۆیەمین ڕۆژی (ذي الحجة).

٤-دوو شەممان و پێنج شەممان.

٥-ڕۆژە سپییەکان(الأيام البيض) واتە/١٣ و١٤ و ١٥ ی مانگی عەرەبی.

٦-ڕۆژ نە ڕۆژی بەڕۆژوو بوون، ئەمەش ڕۆژی پێغەمبەر داوودە(علیە السلام) کە باشترین ڕۆژووی سونەتە.

٧-نۆ مینەی حاجیان واتە نۆ ڕۆژ لە مانگی(ذي الحجة).

٨-مانگی موحەڕەم بە گشتی.

٩-ڕۆژووی مانگی شەعبان، چونکە لە عائیشەوە هاتووە کە پێغەمبەر خوا (دروودی خوای لەسەر بێ)زۆربەی مانگی شەعبان بە ڕۆژوو بووە.

## ئەو ڕۆژانەی کە نەهی کراوە تێدا بەڕۆژووبین

١-جەژنی ڕەمەزان و قوربان:زانایان کۆکن لەسەر حەرامییەتی ڕۆژوو گرتن لە جەژنی ڕەمەزان و قوربانـدا، چ ڕۆژووی فەرز بێ یان سونەت، لەبەر فەرموودەکەی پێغەمبەری خوا(دروودی خوای لەسەر بێ) کە فەرموویەتی:

(نَهَى عَن صِيَامِ يَومَينِ يَومِ الفِطرِ وَ يَومِ النَّحرِ).[١]

٢-(أيام التشريق):-واتە دووەم و سێ یەم و چوارەم ڕۆژانی جەژنی قوربان کە لای زۆربەی زانایان حەرامە ڕۆژوو بوون تیاندا لەبەر فەرموودەکەی پێغەمبەری خودا (دروودی خوای لەسەر بێ) کە فەرموویەتی:

(أَيَّامُ التَّشرِيقِ أَيَّامُ أَكلٍ وَشُربٍ ).[٢]

واتە/ ڕۆژانی تەشریق ڕۆژانی خواردن و خواردنەوەیە.

٣-(یوم الشک):- ڕۆژی گوماناوی کە سی یەمین ڕۆژی مانگی شەعبانە، ئەمەش ئەگەر مانگ نەبینرا، لەبەر هەور یان هەر هۆکارێکی تر، واتە لە سی یەم ڕۆژی مانگی شەعبان بە ڕۆژوو بیت بە نیەتی ڕەمەزان لەکاتێکدا مانگی ڕەمەزان نەبینراوە، کە ئەمەش دروست نییە لەبەر فەرموودەکەی پێغەمبەری خوا(دروودی خوتی لەسەر بێ)کە فەرموویەتی:

---

(١)أخرجه البخاري برقم (١٩٩١) ومسلم (١١٣٨).
(٢)أخرجه مُسلم برقم (١١٤١).

(مَن صَامَ اليومَ الَّذي يُشَكُّ فِيهِ فَقَد عَصَى أبَا القَاسِمِ).[1]

واتــە/هـەر کەسێ ڕۆژێ بە ڕۆژوو بێت کە گومانی تێدا بێت، ئەوە سەر پێچی باوکی قاسمی کردووە کە پێغەمبەر خوایە (دروودی خوای لەسەر بێ).

٤- ڕۆژی هەینـی بە تەنها:- دروسـت نییـە ڕۆژوو گـرتنی ڕۆژی هەینی بە تـەنها، چونکە پێغەمبەری خودا(دروودی خوای لەسـەر بێ)نەهی لێ کردووە، کە فەرموویەتی: (لا يَصُومَنَّ أَحَدُكُم يَومَ الجُمعَةِ إلا يَوماً قَبلَهُ أو بَعدَهُ).[2]

واتــە/هـیچ کـەس لە ئێوە ڕۆژی هەینی بە ڕۆژوو نەبێت ئیلا ڕۆژێ پێشی یان ڕۆژێ دوای بەڕۆژوو بێت لە گەڵیدا.

٥-ڕۆژوو گرتنـی هـەمـوو سـاڵە کـە (صيـام الدهـر): وەکـو پێغەمبـەری خـوا (دروودی خـوای لەسـەر بـێ) فەرموویەتـی: (لاصَامَ مَن صَامَ الدَّهرَ).[3]

٦-ڕۆژی شـەممـە بـە تەنهـا: لای زۆربـەی زانایان ناپەسندە- نەویستراوە (مکروە) ڕۆژی شـەممە بـە تـەنها بەڕۆژوو بێت، بەڵام لای پێشـەوا مالک و ئیبن تـەیمییەو ئیبن قەیم دروستە، چونکـە ئـەو فەرموودانـەی کـە لـەم بـارەوە هاتـووە بـەلاوازی دەزانـن.

---

(١) أخرجه أبو داود برقم (٢٣٣٤) والترمذي (٦٨٦) والنسائي (٢١٨٨) وصححه الألباني.

(٢)أخرجه البخاري برقم (١٩٨٥) ومسلم (١٩٢٩).

(٣)أخرجه البخاري برقم (١٩٧٩) ومسلم (١١٥٩) وابن ماجه (١٧٠٦).

تێبینی// ئەگەر ڕۆژی عەرەفە کەوتە ڕۆژی هەینییەوە یان ڕۆژی شەممەوە دروستە بەتەنها بەڕۆژوو بین، چونکە بە نییەتی عەرەفەوە بە ڕۆژوو دەبێن.

## ئەوکەسانەی کە دروستە بە ڕۆژوو نەبن

١- نەخۆش: زانایان کۆکن لەسەر ئەوەی کە دروستە نەخۆش بە ڕۆژوو نەبێت لە مانگی ڕەمەزاندا، بەڵام دەبێت لە دوای ڕەمەزانەوە ئەو ڕۆژووانە بگێڕێتەوە، چونکە پەروەردگار فەرموویەتی:

﴿ وَمَن كَانَ مَرِيضًا أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِّنْ أَيَّامٍ أُخَرَ﴾ [البقرة ١٨٥]

واتە/ هەرکەسێ کە نەخۆش بوو یان لە سەفەردا بوو نەیتوانی بە ڕۆژوو بوو با لە ڕۆژانی تردا بیگێڕێتەوە لە دوای ڕەمەزان.بەڵام ئەگەر نەخۆشییەکی سووک بوو وە کاریگەری نەکاتە سەری کاتێ بە ڕۆژوو دەبێت وەکو سەر ئێشەیەکی سووک یان ئازاری ددان، لەم کاتەدا دروست نییە بە ڕۆژوو نەبێت.

٢-گەشتیار/(موسافیر) : دروستە موسافیر بەڕۆژوو نەبێت، بەڵام دەبێت دوای ڕەمەزان بگێڕێتەوە هەر وەکو خوای گەورە فەرموویەتی:

﴿وَمَن كَانَ مَرِيضًا أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِّنْ أَيَّامٍ أُخَرَ﴾ [البقرة ١٨٥]

واتە/ هەرکەسێ کە نەخۆش بوو یان لە سەفەردا بوو

نەیتوانی بە ڕۆژوو بوو با لە ڕۆژانی تردا بیگێڕێتەوە لە دوای ڕەمەزان. بەڵام ئەگەر موسافیر بەڕۆژووبوو لە کاتی سەفەرەکەیدا دروستە و ڕۆژووەکەی تەواوە.

٣-ئافرەتی سک پڕو شیردەر : ئافرەتی سک پڕ و شیردەر دروستە بۆیان بەڕۆژوو نەبن لە ڕەمەزاندا، چونکە سک پڕی(حمل) وشیردان دەبنە نارەحەتی و مەشەقەت لەسەر ئافرەتان، بەڵام زانایان جیاوازیان هەیە کە ئایا ئەو ڕۆژانەی کە بەڕۆژوو نەبوونە دەبێت بیگێڕنەوە یان کەفارەتەکەی بدەن، لای پێشەوا ئیبن عەباس و ئیبن عومەر و هەروەها پێشەوا ئەلبانی لەم سەر دەمەدا ئەوەیە بەس کەفارەت دەکەوێتە سەریان، وە لای هەندێ لە زانایان گێڕانەوەیان لە سەرە، بەڵام لای هەندێ لە زانایانی تر دەفەرموون گێڕانەوە و کەفارەتیش دەکەوێتە سەریان.

تێبینی// کەفارەتی ڕۆژوو بریتییە لە تێرکردنی هەژارێک بۆ هەر ڕۆژێک، ئەگەر بە خواردنی ووشکەش کە فارەتەکەی دا، دەبێت (٦٠٠)گم بەنزیکەی (تقریبا)لە خواردنی ڕۆژانەی خەڵکی بدات، بەڵام لای هەندێ لە زانایان نیو صاعە.

٤-پیرێ ژن و پیرە پیاو و نەخۆشێک کە ئومێدی چاک بوونەوەی لێ نەکرێت: زانایان کۆکن لەسەر ئەوەی کە ئەمانە دروستە بۆیان کە بە ڕۆژوو نەبن و وە گێڕانەوەشیان لەسەر نییە، بەڵام دەبێت فیدیە بدەن بۆ هەر ڕۆژێک خواردنی هەژارێک، چونکە خوای گەورە فەرموویەتی:

﴿ وَعَلَى الَّذِينَ يُطِيقُونَهُ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ ﴾ [البقرة ١٨٤]

واتــە/ ئەو کەسانەش ناتوانن بە ئاسانی بە ڕۆژوو بن و زۆر بەسـەختی بۆیـان دەگـیرێت، وەک پیـر و نەخۆشـی سـەر جێگـە و ئـافرەتی شیردەر و ژنـی دووگیـان، ئەوە پێویسـتە لـە جیاتـی هـەر ڕۆژێ خواردنـی ژەمـێ خۆراک بدەن بـە هەژارێـک.

٥-ئافـرەتێک خوێنـی سـوڕی مـانگانە یان خوێنی منداڵ بوونی هـەبێت:زانـایان کۆکـن لەسـەر ئـەوەی ئـافرەتێک لـە عادەدا بێت یـان منداڵـی بووبێـت و خوێنـی منـداڵ بوونـی هەبێـت حەرامـە کە بە ڕۆژوو بن، بـەڵام دەبێت ئەو ڕۆژانـە بگرنـەوە لـە دوای ڕەمـەزان،

تێبینـی// ئەگـەر ئافرەتێـک مانگـی ڕەمـەزان بـە ڕۆژوو نەبـوو لەبەر ئەوەی کە شیردەرە، بـەڵام لـە نێـوان مـانگەکـەدا تـووشی خـوێنی عـادە بـوو، ئـەوە دەبێت ئەو ڕۆژانـەی کە لە عـادەدا بووە بگرێتەوە، نابێت حیسـابی ئەوە بکات کـە شـیر دەدات، بـەڵام بـۆ ڕۆژەکانـی تـر فیدیـە دەدات، هـەروەها ئەگـەر ئافرەتێک پێش ڕەمـەزان منداڵـی بـوو وە خـوێنی منداڵ بـوونی هـەبوو نابێت حیسـابی ئـەوە بکات کـە شیـر دەدات و فیدیە بـدات لـە جیاتـی مانـگی ڕەمـەزان، بەڵـکو دەبێـت مـانگی ڕەمـەزان بگرێتـەوە کە خوێنی منداڵ بوونی نەما، چونکە لـە کاتێکدا بۆی هەیـە فیدیـە بـدات کـە تەنها لەبەر شیردانەکەی یان لەبەر سکپڕیکەی(الحمل) بەرۆژوو نەبێت، واللـه أعلـم.

# گێڕانەوەی ڕەمەزان

١- ئـەگەر بەبێ بیانـوو (عُذر) ڕۆژووی نەگرت:-زۆربـەی زانایـان لـەسەر ئـەوەن ئەگـەر کەسـێک بەبێ بیانوو بە ڕۆژوو نەبوو یان چەند ڕۆژێک لە ڕەمـەزان بە ڕۆژوو نەبوو، واجبـە لـەسەری بگێڕێتـەوە چ بە بیانوو بێت یان بـەبێ بیانـوو، بـەڵام پێشـەوا ئیبن حـەزم بۆ ئـەوە چووە کە شـەرعی نییە گێڕانـەوەی ڕۆژوو بۆ ئـەو کەسانەی کە بەبێ بیانوو ڕۆژو ناگـرن، چونکە لە ئیبن مەسعودەوە هاتووە کـە فەرموویەتـی:

(مَن أَفطَرَ يَوماً مِن رَمَضَان مِن غَيرِ عُذرٍ وَلاَ رُخصَة لَم يُجزِه صِامَ الدَّهر كُلهُ).[١]

٢-گرتنـەوەی ڕۆژووی ڕەمـەزان واجب نییـە بەپەلـە لـە دوای ڕەمـەزان دەس بەجێ بگێڕدرێتەوە:-گێڕانـەوەی ڕۆژووە فەوتاوەکانی ڕەمـەزان دەس بەجێ واجب نیە بەپەلە بگێڕدرێتەوە لـە دوای ڕەمـەزان، بەڵکو واجبـە گرتنـەوەی لـە هـەر کاتـێکدا بێت، لەبـەر فەرموودەکـەی عائیشـە(ڕەزای خـوای لـێ بێـت) کە فەرموویەتـی:

(كَانَ يَكُونُ عَلَيَّ الصَّومُ مِن رَمَضَانَ فَمَا أَستَطِيعُ أَن أقضِيهُ إِلا فِي شَعبَان).[٢]

واتـە/ ڕۆژووی چەند ڕۆژێ لە ڕەمەزان لەسەرم بوو، نەم توانی بگێڕمـەوە ئیلالـە شـەعبان نەبێـت کـە مانگێ پێش ڕەمەزانێ تر دەکات، پێشـەوا ئیبن حەجـەر دەفەرمووێت:فـەرموودەکە بەڵگەیە لەسـەر دروسـتێتی دواخسـتنی گێڕانـەوەی ڕۆژووی ڕەمـەزان،

(١)ضعيف،أخرجه الترمذي برقم (٧٢٣) وابن ماجه (١٦٧٢) والدارمي (١٧٥٥).
(٢)أخرجه البخاري برقم (١٩٥٠) ومسلم (١١٤٦).

چ دواخستنەکە بە بیانووبێ یان بەبێ بیانوو، بەڵام باشترە پەلە بکرێت لە گێڕانەوەی ڕۆژووە فەوتاوەکان، چونکە مرۆڤ نازانێت چ بەسەر دێت لە نەخۆشی و ناخۆشی ژیان، نەکو بۆی نەگونجێ لە گێڕانەوەی ڕۆژووە فەوتاوەکانی.

تێبینی//

أ-ئەگەر کەسێ ڕۆژووە فەوتاوەکانی نەگرێتەوە لە دوای ڕەمەزان هەتا ڕەمەزانێ تر دێت بەسەریدا، ئەو کاتە واجبە دوای ڕەمەزانەکەی تربیگێڕێتەوە، بەڵام زۆربەی زانایان دەفەرموون دەبێت فیدییەش بدات لە گەڵ گێڕانەوەی ڕۆژووەکانی ئەگەر بەبێ عوزر دوای بخات، هەرچەندە ڕای پەسەند ئەوەیە کە هیچ ناکەوێتە سەری، جگە لە گێڕانەوەی ڕۆژووە فەوتاوەکانی، ئەمەش ڕای پێشەوا ئەبو حەنیفەو ئیبن حەزمیشە، چونکە هیچ بەڵگەیەک لەسەر ئەوە نەهاتووە کە فیدیە بکەوێتە سەری.

ب-گێڕانەوەی ڕۆژووە فەوتاوەکانی مانگی ڕەمەزان واجب نییە بە دوای یەکدا بێت، بۆ نموونە/ئەگەر کەسێک شەش ڕۆژ قەرزار بوو واجب نییە لەسەری هەر شەش ڕۆژەکە بەسەر یەکەوە بگرێتەوە، چونکە خوای گەورە فەرموویەتی:

﴿ فَعِدَّةٌ مِّنْ أَيَّامٍ أُخَرَ ﴾ [البقرة ١٨٤]

واتە/هەر کەسێ نەخۆش بوو یان لەسەفەردابوو، نەیتوانی بە ڕۆژوو بێت، بالەچەند ڕۆژێکی تردا بیان گێڕێتەوە،

وە هەروەها ئیبن عەباس فەرموویەتی: (لاَ بَأسَ أَن يَفرَقَ)[1]

واتە/هیچی تێدا نییە ئەگەر بە جیا بیگێڕێتەوە.

٣-ئەگەر کەسێک مردوو ڕۆژووی لەسەر بوو:-

ئەگەر کەسێ مردوو ڕۆژووی فەرزی لەسەر بووچ ڕۆژووی ڕەمەزان بوو یان ڕۆژووی نەزر بوو بە گشتی دروستە کەس و کارەکەی بۆی بگێڕنەوە، چونکە پێغەمبەری خوا(دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی:

(مَن مَاتَ وَعَلَيهِ صِيام، صَامَ عَنهُ وَلِيُّهُ).[2]

واتە/ هەر کەسێ بمرێت و ڕۆژووی لەسەر بێت، واتەقەرزار بێت، با کەس و کارەکەی بۆی بگێڕنەوە، ئەم داخوازیش(ئەمرەش) بۆ سونەتە نەک بۆ واجب لای زۆربەی زانایان، واتەواجب نییە لە سەر کەس و کارەکەی بۆی بگێڕنەوە، بەڵکو سونەتە.

تێبینی//

١- ئەگەر کەسێ مردوو ڕۆژووی لەسەر بوو، دروستە چەند کەسێک لە ڕۆژێکدا ڕۆژووەکانی بۆ بگرنەوە، بۆ نموونە/ ئەگەر کەسێ(١٠)دە ڕۆژ قەرزار بوو، دروستە(١٠) دە پیاو لەیەک ڕۆژدا ڕۆژووەکانی بۆ بگرنەوە.

(١)إسناده صحيح :أخرجه البيهقي (٢٥٨/٤)والدار قطني (١٩٢/٢).
(٢)أخرجه البخاري برقم (١٩٥٢) ومسلم (١١٤٧).

٢- لای هەندێ لە زانایان وایە کە فەرموودەکە تایبەتە بە ڕۆژووی نەزر(نذر) هەر بۆیە پێشەوا ئیبن قەیم:دەفەرمووێ کەس ڕۆژوو بۆ کەس ناگرێت، مەبەستی ڕۆژووی فەزرە، بەڵام ڕۆژووی نەزر کەس و کارەکەی بۆی دەگرنەوە.



# بابەتەکانی ئەم بەشە

یەکێکی تر لە پایەکانی ئیسلام حەج کردنەکە مەبەست لێی سەردانی کردنی ماڵی پەروەردگارە، بۆ جێ بەجێ کردنی پەرستنێکی تایبەت لە کاتێکی تایبەت دا بە شێوازێکی دیاری کراو.

## حوکمی حەج کردن

حەج کردن فەرزی عەینە لەسەر هەموو موسڵمانێکی پێ گەیشتووی ژیری ئازادی بە توانا (توانایی مادی ومەعنەوی)، لە هەموو تەمەندا یەک جارە، لەبەر فەرموودەکەی پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێ)کە فەرموویەتی:

(يَأَيُّهَا النَّاس، قَد فَرَض اللهُ عَلَيكُم الحَجَّ فَحُجُّوا).[1]

واتە/ئەی خەڵکینە بەڕاستی خوای گەورە حەجی لەسەر فەرزکردوون، کەواتە حەج بکەن، لای زۆربەی زانایان ئەگەر کەسێ توانای حەجی هەبێت وە مەرجەکانی تێدا هاتبێتە جێ دەبێت دەس بەجێ حەج ئەنجام بدات و کەم تەرخەمی تێدا نەکات، ئەگەر کەم تەرخەمی تێدا بکات و دوای بخات تاوان بار دەبێت، هەر چەندە پێشەوا شافعی و هەندێ لە زانایانی تر بۆ ئەوە چوونە کەکەسێ توانای حەجی هەبێ تاوان بار نابێت کە دوای بخات، بەمەرجێ نیەتی هەبێت لە داهاتوودا ئەنجامی بدات.

(١)أخرجه المسلم برقم (١٣٣٧).

تێبینی// ئافرەت مەرجە پیاوەکەی یان مەحرەمێکی لە گەڵدا بێت بۆ ئەنجام دانی حەج، بەڵام ئەگەر حەجی ئەنجام دا بەبێ ئەوەی مەحرەمێکی لەگەڵدا بێت یان مێردەکەی ئەوە حەجەکەی دامەزراوە و تەواوە، بەڵام تاونبار دەبێت لەسەر ئەوەی کە بەبێ مەحرەم حەجی ئەنجام داوە، هەر وەکو: شافعییەکان و مالکییەکان بۆ ئەوە چوونە کە مەحرەم مەرج نییە بۆ ئەنجام دانی حەج.

## چەند شوێنێکی دیاری کراو هەیە بۆ ئیحرام بە ستن

پێغەمبەر خوا(دروودی خوای لەسەربێ) پێنج شوێنی دیاری کردووە بۆ ئیحرام (ئیزارو ڕیداء-جلی تایبەتی حەج)بەستن، بۆیە واجبە لەسەر هەموو کەسێ کە ویستی حەج کردن یان عەمرە کردنی هەیە ئیحرام ببەستێت لە شوێنێکیان، ئەو شوێنانەش ئەمانەن:-

١-(ذو الحلَيفَة):-دیاری کراوە بۆ خەڵکی(مەدینە)، وە بۆ ئەوانەش کە بەسەر ئەواندا تێ دەپەڕن، وەئێستاش ناو نراو بە(أبیار علی) کە(٤٥٠) کم دوورە لە مەککەی پیرۆزەوە.

٢-(الجَحِفَة):-دیاری کراوە بۆ خەڵکی شام و مەغریب و میصر وە بۆ ئەوانەش کە بەسەر ئەواندا تێ دەپەڕن، کە نزیکە لە شاری(رابغ) کە ئێستا خەڵکی لەشاری(رابغ) ئیحرام دەبەستن، (١٨٣)کم لەمەککەی پیرۆزەوە دوورە.

٣-(قَرنُ المَنَازِل):-دیاری کراوە بۆ خەڵکی(نَجد)، وە بۆ ئەوانەش کە بەسەر ئەواندا تێ دەپەڕن، وە ئیستا ناونراوە(السبیل الكبیر) یان بە(وادی السبیل )، کە (٧٥) کم دوورە لە مەککەی پیرۆزەوە.

٤-(يَلَملَم):-دیاری کراوە بۆ خەڵکی (یەمەن)، وە بۆ ئەوانەش کە بەسەر ئەواندا تێ دەپەڕن، کە ئێستا خەڵکی لە(السعدیة) ئیحرام دەبەستن، وە(٩٢) کم دوورە لە مەککەی پیرۆزەوە.

٥-(ذاتُ عِرق):- دیاری کراوە بۆ خەڵکی (عێراق)، وە بۆ ئەوانەش کە بەسەر ئەواندا تێ دەپەڕن، کە(٩٤) کم دوورە لە مەککەی پیرۆزەوە.

واجبە لەسەر هەرکەسێ کە تێپەڕ دەبێت بەسەر ئەم شوێنانەدا کە ویستی حەج یان عومرە کردنی هەیە ئیحرام ببەستێت لێیان، وە ئەوەی تێپەڕبێت بە ئەنقەست بێ ئەوەی ئیحرام ببەستێت لێیان دەبێت بگەڕێتەوە بۆیان و ئیحرام ببەستێت لەوێ، ئەگەر نا خوێن دەکەوێتەوە سەری کە سەر برینی ئاژەڵێکە(شەکێک) کە لەمەککە سەری دەبڕێت و دابەشی دەکات بەسەر هەژاراندا، پێغەمبەری خوا(دروودی خوای لەسەر بێ) فەرموویەتی:

(فَهُنَّ لَهُنَّ وَ لِمَن أَتَى عَلَيهِنَّ مِن غَيرِ أَهلِهِنَّ مِمَّن أَرَادَ الحَجَّ والعُمرَةَ).[١]

**واتە/** ئەمانە بۆ ئەوان و ئەوانەشی بەسەر ئەواندا تێپەڕدەبن، بۆ کەسێ کە ویستی حەج و عەمرەی هەیە، وە خەڵکی مەککەو ئەوەی لە مەککەدایە و خەڵکی مەککە نییە، هەر لە

(١)أخرجه البخاري برقم (١٥٢٦) ومسلم (١١٨١).

مەککەدا ئیحرام دەبەستن بۆ حەج، بەلام بۆ عەمرە دەبێت دەرچن بۆ دەرەوەی مەککە ئیحرام ببەستن وەکو (تەنعیم)، ئەمەلای هەندێ زانایان، بەلام لای هەندێ لە زانایانی تر دەبێت بگەڕێنەوە بۆ ئەو شوێنانەی کە دیاری کراوە بۆ ئیحرام بەستن کە باسمان کرد پێشتر، وە ئەو کەسانەی کە ماڵەکانیان لە نێوان میقات و مەککەدایە واتە نزیک ترن لەمەککەوە لەو شوێنانەی کە دیاری کراوە، ئەوە لە ماڵەکانی خۆیانەوە ئیحرام دەبەستن وەکو دانیشتووانی(جدة - بحرة - مستورة - أم السلم - بدر - الشرائع)، ئەمانەلە ماڵەکانی خۆیان ئیحرام دەبەستن یان لەو شوێنانەی کە نیەتی حەج دێنن یان عومرە، لەبەر فەرموودەکەی پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێ) کە فەرموویەتی:

(فَمَن كَانَ دُونَهُنَّ فَمِن أَهلِهِ، حَتَّى أَهلُ مَكَّةَ يُهِلُّونَ مِنهَا).[1]

واتە/ هەرکەسێ لەو شوێنانە نزیک ترە لە مەککەوە ئەوە لە ماڵی خۆیەوە ئیحرام دەبەستێت، هەتا وەکو خەڵکی مەککە لە مەککەوە ئیحرام دەبەستن.

تێبینی//

١-(ئیبن مونزیر) دەفەرموێت:-زانایان تێکڕا لەسەر ئەوەن کە دروستە ئیحرام بەستن پێش(میقات)، بەلام باش نییەچونکە پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێ) شوێنەکانی دیاری کردووە.

(١)أخرجه مسلم برقم (١١٨١).

٢-ئەگەرکەسێ بەسەر دوو میقاتدا تێپەڕێ، ئەوە لای زۆربەی زانایان دەبێت لەیەکەمیان ئیحرام ببەستێت دروست نیە دوای بخات بۆدووەم، بەڵام لای پێشەوا ئەبو حەنیفە ومالیک دروستە دوای بخات.

## ئیحرام بەستن (الأحرام)

یەکەم کردەوەی حەج و عەمرە ئیحرام بەستنە، کە نیەتی حەج یان عەمرە یان هەر دووکیان دێنێ، وە یەکێکە لە پایەکانی حەج و عەمرە هەر وەکو پێغەمبەری خوا(دروودی خوای لەسەر بێ)فەرموویەتی:

(إِنَّمَا الأَعْمَالُ بِالنِّيَاتِ).[١]

واتە/ بەڕاستی وەرگرتنی کردەوەکان بە پێی نییەتەکانە.

## جۆرەکانی ئیحرام بەستن

واجبە لەسەر هەر کەسێ کە نیەتی حەجی هەیە یەکێک لەو سێ جۆر ئیحرام بەستنە هەڵبژێرێت:-

١-التَمَتُّع ٢- القِران ٣-الإفراد

التَمَتُّع

ئەویە کە ئیحرام دەبەستێت بە نییەتی عەمرە لە یەکێک

(١)أخرجه البخاري برقم (١) ومسلم (١٩٠٧).

لە مانگەکانی حەجدا کە(شوال و ذو القعدة ودە ڕۆژ لە ذو الحجة)وە دەڵێت

(لبيك عمرة متمتعاً بها الى الحج) پاشان تەواف و کۆششی (سەعی) نێوان سەفاو مەروا دەکات و سەری کورت دەکاتەوەو خۆی لە ئیحرام دەکاتەوە، وە هەموو شتێکی بۆ حەڵاڵ دەبێت لە قەدەغەکراوەانی ئیحرام، پاشان لە ڕۆژی هەشتەمی(ذو الحجة) ئیحرام دەبەستێ بە حەج لە شوێنی خۆیەوە دەر دەچێت بۆ دروشمەکانی (شِعَارات) حەج و حەجەکەی تەواو دەکات، وە شەکێک دەکەوێتە سەری یان بە حەوت کەس ووشترێک یان ڕەشەوڵاخێک دەکەوێتە سەریان، ئەگەر نەیبوو ئەوە سێ ڕۆژ بە ڕۆژوو دەبێت لە حەجدا وە حەوت ڕۆژ بە ڕۆژوو دەبێ ئەگەر گەڕایەوە بۆ لای کەس و کاری.

## چۆنێتی حەجی التَمَتُع

١-لە میقات ئیحرام بە عومرە دەبەستێت، لە یەکێک لە مانگەکانی حەجدا،

٢-تەوافی عومرە دەکات لە حەرەم،

٣-سەعی نێوان صەفا و مەروا دەکات لە حەرەم بۆ عەمرەکەی.

٤-سەری کورت دەکاتەوە،

٥- خۆی لە ئیحرام دەکاتەوە و قەدەغەکراوەکانی بۆ حەڵاڵ

دەبێت،

٦- لە ڕۆژی هەشتەمی (ذي الحجة) کە بە ڕۆژی(التَّرْوِيَة) ناسراوە، ئیحرام دەبەستێت بە حەج کردن و ڕوو لە (منی) دەکات، وە نوێژەکانی کورت دەکاتەوە بە بێ کۆکردنەوە(الجمع) کردن.

٧- لە ڕۆژی نۆیەمی(ذي الحجَّة) لە دوای خۆر کەوتن بەرەو عەرەفە بەڕێ دەکەون نوێژی نیوەڕۆ وعەسر بەکورت کردنەوە و کۆکردنەوەی پێش خستن (جمعُ التقديم) ئەنجام دەدەن، پاشان لە سنوری عەرەفە دەوەستن و نزاو پاڕانەوە (دُعاء) زۆر دەکەن هەتا خۆر ئاوابوون.

٨-لە دوای خۆر ئاوابوون بەرەو (مزدلفة) بەڕێدەکەون و نوێژی مەغریب و عیشا بە کورت کردنەوەو (القصر) کۆکردنەوەی دوا خستن (الجمع تأخير) ئەنجام دەدرێت کاتێک گەیشتن،

٩-لە دەیەم ڕۆژی(ذي الحجة) پێش خۆر کەوتن بەرەو(منی) بەڕێدەکەون، لە(منی) ڕەجمی(جمره العقبه)ی گەورە دەکرێت دوای خۆر کەوتن تەنها بە حەوت بەرد،

١٠-هەر لەدەیەم ڕۆژی(ذي الحجة) لە (منی) ئاژەڵێک سەر دەبڕێت و پاشان سەر دەتاشێ یان کورتی دەکاتەوە، پاشان ئیحرام دەکاتەوەو جلەکانی خۆی لەبەر دەکات و هەموو شتێکی قەدەغە کراوی بۆ حەڵاڵ دەبێت جگە لە جووت بوون(جیماع) لەگەڵ خێزاندا، کە پێ دەوترێت(التحلل الأول)، پاشان هەر

لە دەیەم ڕۆژی (ذي الحجة)کە یەکەم ڕۆژی جەژنی قوربان دەکات دەگەڕێتەوە بۆ حەرەم تەوافی(ئیفاضة) دەکات و سەعی نێوان صەفاو مەروا دەکات پاشان جیماعیشی بۆ حەلال دەبێت کە پێی دەوترێت(التحلل الثاني) پاشان هەر لە دەیەم ڕۆژ دەگەڕێتەوە بۆ (منی) و ڕۆژانی (أيام التشريق) لە (منی) دەمێنێتەوە،

١١-لە ڕۆژی یازدەیەمی(ذي الحجة) لە(منی) لە دوای نیوەڕۆ (ڕەمی جەمەرات) دەکات کەپێی دەوترێت شەیتان ڕەجم کردن، بچووک و ناوەندو گەورە بە حەوت بەرد بۆ هەر دانەیەکیان،

١٢-لە ڕۆژی دوازدەیەم بە هەمان شێوە لە دوای نیوەڕۆ ڕەجمی شەیتان دەکات بچووک و ناوەند و گەورە بە حەوت بەرد بۆ هەر دانەیەکیان،

١٣-لە ڕۆژی سیازدەهەم بە هەمان شێوە بەڵام دروستیشە کەسێک پەلەی بوو چاوەڕێی سیازدەهەم ڕۆژ نەکات و هەر لە ڕۆژی دوازدە هەم پێش خۆر ئاوا بوون بگەڕێتەوە بۆ حەرەم و تەوافی وەداع بکات و بگەڕێتەوە بۆ وەڵاتی خۆی،

١٤-لە دوای ڕەجمی جەمەرات لە سیازدەهەم ڕۆژدا دەگەڕێتەوە بۆ حەرەم بۆ تەوافی ماڵ ئاوای(الوداع) پاشان کردەوەکانی حەج کۆتایی دێت.

## القِران

ئەوەیە کەسێ ئیحرام دەبەستێ بە عەمرەو حەج بە یەکەوە وەدەڵێت (لبيك عَمرة و حجاً)، کاتێک گەیشت بە مەککە تەوافی گەیشتن دەکات (طواف القدوم) و کۆششی نێوان صەفاو مەروا دەکات بۆ حەج و عەمرەکەی بەیەک کۆشش(سعياً واحداً) وە بە ئیحرامەکەوە دەمێنێتەوە وخۆی لە ئیحرام ناکاتەوە هەتا ڕۆژی هەشتەمی(ذي الحجَّة)دەر دەچێت بۆ کردەوەکانی حەج جگە لە سەعی نێوان صەفاو مەروا نەبێت کە ئەنجامی نادات چونکە لە پێشتر ئەنجامی داوە لە دوای تەوافی هاتن(القدوم)، هەروەها ئاژەڵێک دەکەوێتە سەری یان بە حەوت کەس ووشترێک یان مانگایەک، ئەگەر نەیبوو سێ ڕۆژ بە ڕۆژوو دەبێ لە حەج، وەحەوت ڕۆژ کاتێ گەڕایەوە بۆ لای کەس و کاری.

## چۆنێتی حەجی قِران

١- لە میقات ئیحرام بە عەمرەو حەج دەبەستێت بەیەکەوە، لە یەکێک لە مانگەکانی حەج دا،

٢-تەوافی گەیشتن (القدوم) لە حەرەم ئەنجام دەدات،

٣-کۆششی(سەعی) صەفا و مەروا دەکات بۆ عەمرەو حەجەکەی لە گەڵ ئەوەشدا بۆی هەیە دوای بخات بۆ دوای (طواف الإفاضة).

٤-حاجی بە ئیحرامەکەیەوە دەمێنێتەوەو دوور دەکەوێتەوە لە قەدەغە کراوەکانی ئیحرام هەتا ڕۆژی هەشتەم(ذي الحجَّة) پاشان دەردەچێت بۆ دروشمەکانی(شعار) حەج.

٥- پاشان کردەوەکانی تری حەجی (قِران) هەروەک حەجی (التَمَتُع) دەکات هەر وەکو لە خاڵی(٦-٧-٨-٩-١٠-١١-١٢-١٣-١٤ )دا باسی لێوە کراوە، جگە لە سەعی صەفاو مەروا نەبێت کە ئەویش دوای سوڕخواردنی گەیشتن(الطواف القدوم) ئەنجامی داوە، ئەگەر ئەنجامی نەدابوو ئەویش ئەنجام دەدات.

## الإفراد

ئەوەیە ئیحرامی حەج دەبەستێ بەتەنها، کاتێ گەیشتە میقات ئیحرام دەبەستێ ودەڵێت(لبيك حجاً)وە کاتێ دەگاتە مەککەی‌پیرۆز سوڕخواردنەوەی گەیشتن (الطواف القدوم) ئەنجام دەدات و پاشان سەعی صەفا و مەروا دەکات بۆ حەجەکەی، وە بە ئیحرامەکەیەوە دەمێنێتەوە هەتاوەکو هەموو دروشمەکانی حەج تەواو دەکات، وە هەموو کردەوەکانی هەر وەکو حەجی (قرانە) جگە لەوە نەبێت کە ئاژەڵ ناکەوێتە سەری، چونکە عەمرەو حەجی بەیەکەوە کۆ نەکردووەتەوە.

تێبینی:

١-ئەو کەسەی حەجەکەی بە(الإفراد) یان (القِران) دەکات دەتوانێت لە ڕۆژی هەشتەمی(ذي الحجَّة) ڕاستەوخۆ بڕوات بۆ (منى)، سەعی و تەوافی گەیشتن (لقدوم) ئەنجام نەدات، بەڵام

دەبێت سەعی صەفاو مەرواکەی لە دوای (طواف الإفاضە) ئەنجام بدات چونکە سەعی صەفاو مەروا یەکێکە لە پایەکانی حەج ئەبێت ئەنجامی بدات، بەلاّم (الطواف القدوم)سونەتە، ئەنجامیشی نەدات دروستە.

٢-زۆر یادی خوا کردن و قورئان خوێندن و نزا کردن لە ڕۆژی عەرەفەو ڕۆژانی تەشریق(أيامُ التشريق) سونەتە.

٣-زۆربەی زانایان لەسەر ئەوەن کە هەرسێ جۆرەکە (التمَتُع -القِران- الإفراد) دروستە هەرکامیان ئەنجام بدرێت.

٤-خەڵکی مەککەی پیرۆز دەبێت حەج بە ئیفراد ئەنجام بدەن لەسەر بۆچونی هەندێ لە زانایان،چونکە خوای گەورە دە ربارەی ئەوکەسانەی کەحەج بەتەمەتوع ئەنجام دەدەن فەرموویەتی :

﴿ ذَٰلِكَ لِمَن لَّمْ يَكُنْ أَهْلُهُ حَاضِرِي الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ ﴾ [البقرة ١٩٦]

واتە/ ئەو تەمەتوع وئیحرام بەستنە بۆکەسێکە کە دانیشتوی دەرەوەی مەککە بێت ،هەرچەندە لای زۆربەی زانایان وەک(مالك وشافعي وأحمد) دەفەرموون:ئەم ئایەتە دەگەڕێتەوە بۆسەربرینی ئاژەڵ،واتەهەرکەسێ حەجی تەمەتوعی ئەنجام دا ئەوە ئاژەڵی دەکەوێتە سەرئەگەر خەڵکی مەککە نەبوو،کەواتە ئەگەر خەڵکی مەککە بوو ئاژەڵ ناکەوێتە سەری، ئیبن حەزمیش بۆئەم بۆچونە ڕۆشتە.

## سونەتەکانی ئیحرام

١-خۆشۆردن پێش ئیحرام بەستن،

٢-خۆبۆن خۆش کردن پێش ئیحرام بەستن، بەڵام دوای ئیحرام بەستن دروست نییە،

٣-لەبەر کردنی دوو دەستماڵی سپی یەکێکیان بکرێتە(إزار) لە ناوکەوە تا ئەژنۆ ئەوی تریان بدرێتە سەر شاندا(رداء)،

٤-دەنگ بەرزکردنەوە بە(تلبية)کردن،

(لبيك اللهم لبيك، لبيك لاشريك لك، إن الحمد والنعمة لك والملك لاشريك لك)، وەکاتی(تلبية)کردن بۆ عەمرە لە ئیحرام بەستنەوە هەتا سەرەتای سورانەوەیە(الطواف)، وە لە حەجدا لە ئیحرام بەستنەوە هەتا دەس پێ کردنی شەیتان ڕەجم کردنی عەقەبە(رمي جمرة العقبة) لەبەیانی ڕۆژی جەژندا.

## قەدەغەکراوەکانی ئیحرام

ئەو شتانەی کە حەرامە لەسەر ئەو کەسەی کە ئیحرامی بەستووە هەشت دانەن:-

١-کردنەوەی یان بڕینی قژ یان نینۆک، بەڵام ئەگەر خۆی کەوت بە بێ مەبەست، یان خۆی قژی یان نینۆکی کردەوە بە

لەبیرچوونەوە یان نەیزانی کە حەرامە هیچی لەسەر نییە،

٢-دروست نییە ئەو کەسەی کە لە ئیحرام دایە بۆن بدات لە خۆی یان جلەکانی، بەڵام ئاساییە ئەگەر شوێنەواری بۆنەکە مابووبە لاشەیەوە کە پێش ئیحرام بەستنەکە لە خۆی دابوو،

٣- دروست نییە ئەو کەسەی کە لە ئیحرام دایە سەری خۆی داپۆشێت، بەهەر شتێک بێت وەکو:-مێزەرو خودرەو کڵاوو.....هتد،

٤- دروست نییە ئەو کەسەی کە لە ئیحرام دایە جلی دوراو لەبەربکات، شەروال –قەمیص(کراس)-عەبا-دەس کێش-گۆرەوی.....هتد، بەڵام ئەگەردەس ماڵی (إزار و ڕداء) دەس نەکەوت دروستە شەرواڵ لە پێ بکات، وە ئەگەر نەعلی دەس نەکەوت دروستە خووف لە پێ بکات،

٥-داواکردنی ئافرەت و مارەبڕین بۆ خۆی یان جگە لە خۆی دروست نییە،

٦-جووت بوون لە گەڵ خێزاندا یان خۆ نزیک کردنەوە لێی بە ئارەزووەوە دروست نییە بۆ کەسێ لە ئیحرامدا بێت

٧-دروست نییە بۆ ئافرەتان لە کاتی ئیحرامدا دەس کێش لە دەس کردن و دەم و چاو دا پۆشین(بالنقاب)،

٨-ڕاوکردنی ئاژەڵی ووشکانی دروست نییە بۆ ئەو کەسەی کە لە ئیحرام دایە چ بە کوشتن بێت یان سەربڕین یان بە ئاماژە بۆکردن(ئیشارەت) یان بە ناردنی سەگی ڕاوبێت.

تێبینی//

١- بەگشتی بۆ کەسێ کە جلی ئیحرامی لەبەر دایە(مِحرَم) وە ئەو کەسەشی کە جلی ئیحرامی لەبەردا نییە (غیر مِحرَم) شتی دۆزراوە دروست نییە هەڵ بگیرێت لە مەککەی پیرۆزدا مەگەر بۆ کەسێ نەبێت کە باسی بکات بەبەردەوامی لە ناو خەڵکیدا.

٢-قەدەغەیە(حەرامە)لەسەر موسڵمان بە گشتی ئەوەی لە ئیحرامدایەوە ئەوەشی لە ئیحرامدا نییە، بڕینی دار ودرەخت و ڕووەکی حەرەم، ئەوەی کە بە سروشتی خۆی ڕوواوە.

٣-حەرامە لە سەر موسڵمانان بە گشتی نێر بێ یان مێ، ڕاوکردنی ئاژەڵی وشکانی بە هەر هۆکارێک بێ لە سنوری حەرمدا (مەککەی پیرۆز) بەڵام بۆ کەسێ کە لە ئیحرامدا بێ لە ناوەوەو دەرەوەی حەرەمیش دروست نییە ڕاوکردنی ووشکانی.

## ئەوشتانەی کە دروستە کەسێ کە جلی ئیحرامی لەبەردا بێ ئەنجامی بدات

١-نەعل لە پێ کردن.

٢- سەعات لە دەس کردن.

٣-ئەنگوسیلە لە پەنجەکردن.

٤-چاویلکە لە چاو کردن.

٥- لەش خوراندن.

٦-سەر شانە کردن.

٧- دەنگ بەر(سەماعە)لە گوێ کردن.

٨-چەتر بەکار هێنان بۆ سێبەرکردن یان.

دانیشتن لە ژێرسەقفی سەیارە یان هەرشتێکی تر.

٩-پێچینی برین بە لەفاف.

١٠-بەکار هێنانی قایشی پشت.

١١-خۆ شۆردن و گۆڕینی جلی ئیحرام.

١٢-کەڵەشاخ گرتن.

١٣-چاو ڕشتن بە کل.

١٤-بۆ ئافرەتان دروستە هەر جۆرە جلێ لەبەر بکەن، بەویستی خۆیان.

## حوکمی ئەو کەسەی کەلە ئیحرامدایە و یەکێك لە حەرام کراوەکانی ئەنجام دەدات جگە لە(ڕاوکردن و جووت بوون(جیماع)

١- دەبێت سێ ڕۆژ بە ڕۆژوو بێت،

٢-یان شەش هەژار تێر بکات،

٣-یان ئاژەڵێک سەر ببڕێت و دابەشی بکات بەسەر هەژارانی حەرەم دا.

تێبینی // کەسەکە بە ویستی خۆیەتی هەر کامیان ئەنجام بدات.

ئەگەر ڕاو کردنی ئەنجام دا

١-دەبێ ئاژەڵێک هاو شێوەی ئەو ئاژەڵەی ڕاوی کردووە سەر ببڕێت، ئەگەر هاو شێوەی هەبێت،

٢-یان ئاژەڵەکە بە چەند پارە مەزەند دەکرێت، خواردنی پێ دەکڕێت و دابەشی دەکات بەسەر هەژارندا بۆ هەر هەژارێک نیو صاع لە خواردن،

٣-یان بە ڕۆژوو دەبێت لە بری خواردنی هەر هەژارێک ڕۆژێک، واتە نرخی ئاژەڵەکە بەشی خواردنی چەند هەژار دەکات ئەوندە ڕۆژە بە ڕۆژوو دەبێت.

## ئەگەرجووت بوو(جیماع) لە گەڵ خێزاندا

جووت بوون گەورەترین حەرام کراوەکانی ئیحرامە، دوو شێوازی هەیە:-

١-ئەگەر جووت بوونی کرد پێش(التحلل الاول) کە ئیحرام کردنەوەیە لە لاشە، ئەو ئەم شتانەی دەکەوێتەسەر:-

أ-تاوان بار دەبێت.

ب-حەجەکەی پوچەڵ دەبێتەوە.

ج-دەبێت ئاژەڵێک سەر ببڕێت و دابەشی بکات بەسەر هەژارانی حەرەمدا.

د-دەبێت حەجەکەی ساڵێکی تر ئەنجام بداتەوە(قضاء).

٢-شێوازی دووەم:-ئەگەر جووت بوونی لەگەڵ خێزانی کرد دوای (التحلل الاول) واتە دوای خۆکردنەوە لە ئیحرام ئەوە حەجەکەی پوچەڵ نابێتەوە، بەڵام دەبێت ئاژەڵێک سەر ببڕێت.

## پایەکانی حەج کردن (أركان الحج)

١-ئیحرام بەستن(الإحرام).

٢-وەستان لە عەرەفە(الوقوف بعرفه).

٣-سورانەوی زیارەت(الطواف الإفاضة).

٤-کۆشش کردن(السعي بين الصفا و المروة).

تێبینی// هەر کەسێ واز لە پایەیەک لە پایەکانی حەج بهێنێ ئەوە حەجەکەی تەواو نییە و پوچەڵ دەبێتەوە،

## پێویستییەکانی حەج(الوجبات الحج)

١-ئیحرام بەستن لەو شوێنانەی کە دیاری کراوە(المیقات).

٢-وەستان لە (عەرەفە) هەتا خۆر ئاوابوون.

٣-مانەوە لە(موزدەلیفە)، هەتا ئەنجام دانی نوێژی بەیانی.

٤-مانەوە لە(منی)شەوەکانی(أیام التشریق).

٥-ڕەجم کردنی شەیتانەکان، (رمی الجمار).

٦-سەر تاشین یان کورت کردنەوەی.

٧-سوڕانەوەی ماڵ ئاوایی(طواف الوداع).

تێبینی //

ئەگەر کەسێ یەکێک لە پێویستییەکانی حەج ئەنجام نەدات ئەوە ئاژەڵێک دەکەوێتە سەری، شەکێک سەر دەبڕێت و دابەشی دەکات بەسەر هەژارانی حەرەمدا.

## سوڕانەوە (الطواف)

واتە/سوڕانەوە بە دەوری ماڵی خوادا(البیت الحرام) بەو شێوەیەی کە لە شەرعدا هاتووە:-

## جۆرەکانی سوڕانەوە

١- سوڕانەوەی هاتن(طواف القدوم):-

ئەم سوڕانەوە پێشی دەوترێت سوڕانەوەی سەڵاو (الطواف التحیة)، کە لای زۆربەی زانایان سونەتەوە دەفەرموون هەر وەکو سەڵاوی مزگەوتە(التحیە المسجد)کە سونەتە لای زۆربەی زانایان، بەڵام لای مالکییەکان واجبە، هەر کەسێ ئەنجامی نەدات، خوێن دەکەوێتە سەری.

٢-سوڕانەوەی ئیفاضە(طواف الإفاضة):-

ئەم سوڕانەوە پێشی دەوترێت سوڕانەوەی زیارەت(طواف الزیارە)کە یەکێکە لە پایەکانی حەج بە تێکڕای زانایان، هەر وەکو پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿ وَلْيَطَّوَّفُوا بِالْبَيْتِ الْعَتِيقِ ﴾ [الحج ٢٩]

واتە/ باتەوافیماڵی دێرین و پارێزراوی خوا بکەن.زانایان کۆکن کە ئەم ئایەتە مەبەستی تەوافی ئیفاضەیە(طواف الإ فاضة).

## کاتی تەوافی ئیفاضة

١- سەرەتایی کاتەکەی: دروست نییە تەوافی ئیفاضە ئەنجام بدرێت پێش ئەو کاتەی شەرع دایناوە، کە دەس پێ دەکات لە دەرچوونی شەبەقی-فەجری -بەیانی ڕۆژی جەژنی قوربانەوە لای حەنەفییەکان ومالکییەکان، بەڵام لای شافعییەکان و

حەنابیلەکان سەرەتاکەی دەس پێ دەکات لەدوای نیوە شەوی جەژنی قوربانەوە.

٢-کۆتایی کاتەکەی:حەنەفییەکان بۆ ئەوە چوونە کە کۆتا کاتی تەوافی ئیفاضە، کۆتا ڕۆژی ڕۆژانی تەشریقە(أيام التشريق)، وە لای مالکییەکان مانگی (ذي الحجة)کاتەکەیەتی، بەڵام ڕای پەسەند ئەوەیە کۆتاکاتەکەیکۆتا ڕۆژی تەشریقە، وە باشترین کاتیش کە ئەنجامی دەی ڕۆژی چەژنە، لەبەر ئەوەی پێغەمبەری خوا(دروودی خوای لەسەر بێ).لەو ڕۆژەدا ئەنجامی داوە.

تێبینی//

أ / ئافرەت ئەگەر توشی عادە بوو پێش تەوافی ئیفاضە ئەگەر توانی چاوەڕێ بکات هەتا پاک دەبێتەوە، پاشان تەواف بکات دەبێت چاوەڕێ بکات، لەبەر فەرموودەکەی پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێ) کە فەرموویەتی بە عائیشە کاتێ توشی عادەبوو

(إِفعَلِي مَايفعَلُ الحَاجُّ غَيرَ أَن لاَ تَطَوَّفِي بِالبَيتِ).[1]

واتە/ ئەوەی حاجییەکان ئەنجامی دەدەن تویش ئەنجامی بدە، جگە لە تەواف کردن بە دەوری ماڵی خوادا، هەتا پاک دەبیتەوە، بەڵام ئەگەر نەیتوانی چاوەڕێ بکات هەتاکو پاک دەبێتەوە، وەک ئەوەی کە گرۆی(قافلە) حاجیان بە جێ ی بهێڵن دەتوانێ تەوافەکەی ئەنجام بدات بە سوڕی مانگانەوە،

(١)رواه البخاري برقم(٢٩٤) ومسلم (١٢١١) ومالك (١٢٢٩) والدارمي (١٨٨٨).

لەبەر پێویستی هەر وەکو یاسا شەرعییەکەمان کە ووتراوە:
((الضَرُوريات تُبيحُ المَحظُورات))

واتە/پێویستییەکان حەرامەکان حەڵاڵ دەکەن.

ب- ئافرەت دەتوانێت حەپ بخوات بۆ ئەوەی توشی عادە نەبێت لە کاتی حەجدا بۆ ئەوەی توشی ئەو ڕاجیاوازییە نەبێت کە لە نێوان زانایاندا هەیە.

٣-سوڕانەوی ماڵ ئاوایی (الطواف الوداع):-

ئەم تەوافە واجبە لای زۆربەی زانایان، جگە لای مالکییەکان کە سونەتە، لەبەر فەرموودەکەی ئیبن عەباس کە فەرموویەتی:

(أُمِرَ النَّاسُ أَن يَكُونَ آخِرُ عَهدِهِم بِالبَيتِ، إلاَّ أَنَّهُ خُفِّفَ عَنِ الحَائِضِ).[1]

واتە/فەرمان کراوە بە خەڵکی کەوا دواین کار لە کارەکانی حەج کردنیان سوڕانەوەی ماڵ ئاوی بێت، بەڵام ئەوە سووک کرایەوە لەسەر ئەو ئافرەتەی کە لەحەیزدا بێت، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر واجبێتی تەوافی ماڵ ئاوای، والله أعلم.

تێبینی// لای ڕێبازی حەنەفیەکان وحەنابلەکان تەوافی ماڵ ئاوای لە سەر خەڵکی مەککەی پیرۆز نیە

## مەرجەکانی سوڕانەوە (طواف)

١- پاکێتی(الطهارة):-پاکێتی لە لەش گرانی و بێ دەس نوێژی

(١)رواه البخاري برقم (١٧٥٥) ومسلم (١٣٢٧).

مەرجە بۆ سوڕانەوە بە دەوری ماڵی خوادا لای زۆربەی زانایان، ئەگەرکەسێ لەش گران بوو یان بێ دەس نوێژ بوو، تەوافەکەی پوچەڵە و ئەژمێر ناکرێت، بەڵام لای حەنەفییەکان و ئیبن حەزم پاکێتی مەرج نییە بۆ تەواف.

٢- داپۆشینی عەورەت (ستر العورة):-دروست نییە بۆ هیچ کەسێ کە تەواف بکات بە ڕووتی، ئەگەر ئەنجامی دا تەوافەکەی دروست نییە لای زۆربەی زانایان، بەڵام لای حەنەفیەکان داپۆشینی عەورەت مەرج نییە بۆ تەواف بەڵکو واجبە، هەر کەسێ عەورەتی دانەپۆشێ تەوافەکەی تەواوە، بەڵام شەکێک دەکەوێتە سەری.

٣-دەبێت سوڕانەوەکە لە دەرەوەی حیجر(الحجر)بێت، ئەگەر لە ناو حیجرەوە تەواف بکات تەوافەکەی تەواو نییە لەبەر فەرموودەکەی پێغەمبەری خوا(دروودەی خوای لەسەر بێ) کە فەرموویەتی: (الحِجر مِن البَيتِ).[1]

**واتە/** حیجر بە دەم کەعبەوەیە.

حِجر/ ئەو بەشەی دەرەوەی کەعبەیە کە ئێستا بە دیوار دەوری گیراوە، کە لەسەردەم قورەیشدا کاتێک کەعبەیان تازە کردەوە و ڕوخاندیان نەیان توانی وەکو خۆی دروستی کەنەوە، بۆ یە بچوکیان کردەوە و وە ئەو بەشەی تریان بە دیوار دەورگرت، کە پێی دەوترێت حیجر(الحجر).

٤-دەبێت لە بەردە ڕەشەکەوە دەس پێ بکات و لە وێشدا

(١)صحيح:أخرجه الترمذي برقم(٨٧٦) وأبو داود (٢٠٢٨)وغيرهما.

کۆتایی بە سوڕانەوە کەی بێنێت،

٥-دەبێت ماڵەکە(بیت)یش بخاتە لای چەپی خۆی لە کاتی سوڕانەوەدا،

٦-مەرجە سوڕانەوەکەی حەوت جاری تەواو بێت،

٧-دەبێت هەر حەوت سوڕانەوەکە بە دوای یەکدابێت، نابێت بچڕانێکی زۆر بکەوێتە نێوان سوڕانەوەکانی، ئەمەش مەرجە لای مالکییەکان و حەنابیلەکان، بەڵام ئەگەر بچڕاندنەکەی لە بەر عوزرێک بوو وەکو سەر ئاوکردن یان دەس نوێژگرتن یان بۆ نوێژکردنی فەرز یان هیلاک بوو نەیتوانی ئەوە هەر لەو شوێنەوە دەس پێ دەکات کە وازی لێ هێناو.

تێبینی//

١- لە دوای تەواف سونەتە دوو ڕکات نوێژی سونەت بکرێت لە دوای مەقامی ئیبراهیمەوە،

٢- قسەکردن دروستە لە کاتی تەوافدا،

٣-دروستە تەواف کردن بەسواری، ئەگەر توانای ڕۆیشتنیشی هەبێت.

## کۆشش کردن لە نێوان صەفاو مەروا(السعي بين الصف والمروة)

کۆشش ڕێکردنە لە نێوان صەفاو مەروادا بە ڕۆیشتن و

هاتن، بە نیەتی پەرستن، کە حەوت جارە لە صەفا دەس پێ دەکات و لە مەروادا کۆتایی دێت، کە یەکێکە لە پایەکانی حەج لەسەر بۆچوونی زۆربەی زانایان.

## ئایا دروستە سەعی کردن پێش تەواف کردن ئەنجام بدرێت

لای زۆربەی زانایان سەعی کردن پێش تەواف کردن دروست نییە، ئەگەر ئەنجامی دا دەبێت لە دوای تەوافەوە ئەنجامی بداتەوە.

## ئایا دروستە ئافرەت لە بێ نوێژی دابێت سەعی نێوان صەفا و مەروا بکات؟

بەڵێ دروستە لەبەر فەرموودەکەی عائیشە(ڕەزای خوای لێ بێت)کاتێ کەوتە سووڕی مانگانەوە(عادەوە) پێغەمبەری خوا(دروودی خوای لەسەر بێ) پێی فەرموو: (إفعَلِي كَمَا يَفعَلُ الحَاجُّ غَيرَ أن لا تَطُوفِي بِالبَيتِ).[1]

واتە/ئەوە بکە کە حاجی دەیکات، تەنها ئەوە نەبێت کەوا تەواف نەکەیت هەتاوەکو خۆت دەشۆیت، هەر چەندە لای هەندێ لە زانایان دروست نییە کۆششی نێوان سەفاو مەرواش بکات، لەوانە زانای پایە بەرز ئیبن عوسەیمین، چونکە لە ڕیواتی تردا هاتووە وەکو لە(موطأ)دا هاتووە (ولابين الصفا والمروة).

(١)رواه البخاري برقم(٢٩٤) ومسلم (١٢١١) ومالك (١٢٢٩) والدارمي (١٨٨٨).

## مەرجەکانی کۆشش کردن (شروط السّعی)

١- دەبێت پاش سوڕانەوە(تەواف) بکرێت چ تەوافی هاتن(قدوم) بێت یان تەوافی ئیفاضە یان تەوافی عەمرە بێت لای زۆربەی زانایان.

٢-دەبێت حەوت جار بێت لە صەفاوە بۆ مەروا، وەلە مەرواشەوە بۆ صەفا، وە دەبێت لە صەفا دەس پێ بکرێت و لە مەروا کۆتایی بێت،

٣-کۆشش کردن دەبێت لە ڕێگەی نێوان صەفاو و مەروا بێت.

## وەستان لە عەرفە

وەستان لە عەرەفە گەورەترین پایەی حەجە چونکە پێغەمبەری خوا(دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: (الحجُّ عَرَفَة).[1] واتە/ حەج عەرەفاتە.

## کاتی وەستان لە عەرەفە

کاتەکەی لای زۆربەی زانایان لە دوای نیوەڕۆوە دەس پێ دەکات هەتا خۆر ئاوا بوون، بەڵام لای پێشەوا ئەحمەد لە دوای فەجری ڕۆژی عەرەفەوە دەس پێ دەکات هەتاوەکو دوای خۆرئاوابوون.

(١)صحيح/أخرجه الترمذي برقم (٨٨٩) والنسائي (٣٠١٦) وابن ماجه (٣٠١٥) وأحمد (١٨٧٧٤).

## مانەوەلە مزدەلیفە لە شەوی جەژندا

مـانەوە لـە موزدەلیفـە هەتـا شـەبەق(فجر)لە شـەوی چەژنـدا لای ئیبـن عەبـاس و ئیـبن زوبـیر و نەخـەعی و شـەعبی و عەلقەمـە، پایەیەکەلەپـایەکانی حـەج، هـەر کەسـێ ئـەنجامی نـەدات حەجەکـەی لـە دەس چـووە، بـە بەڵگـەی فەرموودەکـەی پـەروەردگار کـە فـەرموویەتی: ﴿فَإِذَا أَفَضْتُم مِّنْ عَرَفَاتٍ فَاذْكُرُوا اللَّهَ عِندَ الْمَشْعَرِ الْحَرَامِ﴾ [البقـرة ١٩٨]

واتـە/کـاتێک لـە عـەرەفـە بـڵاوەتـان لـێ کـرد و گـەڕانـەوە خـوارەوە بـۆ موزدەلیفـە لای(المشـعر الحـرام) ووێرد(زیکـر) و یـادی خـوا بکـەن.

المشـعر الحرام/بـە شـاخی موزدەلیفـە دادەنرێـت کـە ئێسـتا بە(قزح) ناسـراوە.بەڵام لای زۆربـەی زانایان مانەوە لە موزدەلیفە بـە واجب دادەنێن، هـەر کەسێ ئەنجامی نەدات خوێن دەکەوێتە سـەری کە سـەر بڕینی شـەکێکە، وەحەجەکـەی تـەواوە.

## سەر تاشین یان کورت کردنەوە

زۆربـەی زانـایان لەسـەر ئـەوەن کـە سـەر تاشین یـان کـورت کردنـەوە یەکێکـە لـە واجبـەکانی حـەج هـەر کەسـێ ئەنجامـی نـەدات خوێـن دەکەوێتـە سـەری، بـەڵام لای پێشـەوا شـافعی سـەر تاشـین یـان کـورت کردنـەوە یـە کێکـە لـە پایەکانـی حـەج، بەنەکردنـی حەجەکـەی پوچـەڵ دەبێتـەوە.

تێبینی//

١-سەرتاسشین باشترە لە کورت کردنەوە.

٢- ئافرەتـان سـەر تاشینیان لەسـەر نییە، تەنها سـەریان کورت دەکەنەوە،

زانـایان جیـاوازن کـە ئەنـدازەی چەنـدێ لـە قژیـان کـورت دەکەنـەوە، بـەڵام ڕووکەشـی فـەرموودەکان ئـەوە دەخـوازن کەویستی خۆیانە چەندی لێ کورت دەکەنـەوە، بە مەرجێ لە پیـاو نەچێت یـان نەشـوبهێتە پیـاو.

٣-ئـەو ئافرەتەی کە لە خوێنی منداڵ بووندایە هەمـان حوکمی ئافرەتێکی هـەیـە کـە لـەسـوڕی مـانـگانە دایە(عادە)، دروسـت نیە تـەواف ئەنجام بدات، بـەڵام کارەکانی تری حەجی بۆ دروستە ئەنجامی بدات.

## ئەوشتانەی حەج بەتاڵ دەکاتەوە (المُبطِلاتُ الحَجّ)

١-جـووت بـوون پـێش ڕەجـم کردنـی (جَمـرَةُ العَقَبَـة) لـەگەڵ خێزانـدا حـەج پوچـەڵ دەکاتـەوە.

٢-بەجێ نەهێنانی پایەیەک لە پایەکانی حەج.

## حەج کردن بۆ کەسێ تر

حـەج کـردن بـۆ کەسـی تـر دروسـتە چ بـۆ کەسـێ مردبێت

یان زیندووبێت، بەڵام نەتوانێت حەج ئەنجام بدات، بە هۆی نەخۆشی یان پیری، بەڵام بە مەرجێ ئەو کەسە خۆی حەجی ئەنجام دابێت پێشتر، هەر چەندە لای پێشەوا مالیک و ئەبو حەنیفە ئەگەر حەجیشی بۆ خۆی ئەنجام نەدابێت هەر دروستە حەج بۆ جگە لە خۆی ئەنجام بدات..

## ئافرەتان

١- پێویستە ئافرەت مەحرە مێکی لە گەڵ بێت بۆ ئەنجام دانی حەج،

٢-دروستە ئافرەتان لەبری پیاوان حەج و عەمرە ئەنجام بدەن، واتە ئافرەت دروستە بە دەل حەج بۆ پیاو ئەنجام بدات، هەر وەکو چۆن دروستە ئافرەت بۆ ئافرەتی تر حەج ئەنجام بدات،

٣-ئافرەتانیش هەر وەک پیاوان سونەتە پێش ئیحرام بەستن خۆیان بشۆن و خۆیان پاک بکەنەوە و نینۆک و تووک لە خۆیان پاک بکەنەوە،

٤-لە کاتی نیەت هێنانی ئیحرامدا ئافرەتان دەبێت پەچەو(نیقاب) و دەس کێش لابدەن، هەر وەکو پێغەمبەری خوا(درووودی خوای لەسەربێ)فەرموویەتی:

(لاَتَنتقِبِ المَرأَةُ المحرِمَةُ وَلاَ تَلبَسِ القُفَّازَين).[1]

---

(١)رواه البخاري برقم (١٨٣٨) والترمذي (٨٣٣).

واتە/ئافرەت کاتێ ئیحرامی بەستبێ، نابێت پەچەو دەس کێش بکات.

٥-ئافرەتان بۆیان دروستە لە کاتی ئیحرام هەر جۆرە جل و بەرگێک لەبەر بکەن بە مەرجێ شەرعی بێت،

٦-سونەتە ئافرەتان دوای ئیحرام بەستن(تلبيه)بکەن، بەلام باش نییە زۆر بەرز دەنگ بکەنەوە(لبيك اللهم لبيك، لبيك لا..... الخ).

٧-ڕاکردن بۆ ئافرەت نییە لە کاتی تەواف و کۆشش کردندا،

٨-ئافرەتان کە لە عادە و خوێنی منداڵ بووندان دروستە هەموو کارەکانی حەج ئەنجام بدەن جگە لە تەواف،

٩-تەوافی ماڵ ئاوای سووک کراوە لەسەر ئافرەتانێ کە لە عادە و خوێنی منداڵ بووندان، واتە بۆیان هەیە ئەنجامی نەدەن،

١٠-ئافرەتان قژیان کورت دەکەنەوە بە ئەندازەی سەر پەنجەیەک، دروست نییە بۆیان سەریان بتاشن،

١١-ئافرەتان دەبێت ئاگاداری تێکەڵ بوون بن لە گەڵ پیاواندا بە تایبەتی لەلای بەردە ڕەشەکە و ڕوکنی یەمانی.

## عومرە ئەنجام دان (العُمرە)

جیاوازی لە نێوان زانایاندا هەیە کە ئایا عەمرە واجبە یان سونەتە

١-عەمرە واجبە یەک جار لە تەمەندا وەکو حەج ئەمەش بە ڕای پێشەوا عومەر و ئیبن عەباس و زەیدی کوڕی ثابت وئیبن عومەر و ڕیوایەتێکیش لای پێشەوا شافعی و ئەحمەد،

*بەڵگە*یەکێک لە بەڵگەی ئەوانەی کە بە واجبی دادەنێن فەرموودەکەی پەروەردگارە کە فەرموویەتی:

﴿وَأَتِمُّوا الْحَجَّ وَالْعُمْرَةَ لِلَّهِ﴾ [البقرة ١٩٦]

واتە/هەر بۆ خوا حەج و عومرە بە چاکی وبە تەواوی ئەنجام بدەن، لەم ئایەتەدا ئەمرەکە بۆ واجب بوونە، وە عەمرەکەش عەتف کراوە بۆ سەر حەج، وە لە زمانەوانیدا (اللغة) عەتف یەکسانی نێوان هەردووشتەکەدەردەخات، کەواتە عەمرەش واجبە.

٢-عەمرە سونەتەوە واجب نییە ئەمەش ڕای ئیبن مەسعود و حەنەفییەکان و مالکییەکان و ڕیوایەتێکی ئیمام ئەحمەد و وەڕای ئیبن تەیمیەشە.

*بەڵگە*یەکێک لە بەڵگەی ئەوانەی کە عەمرە بەسونەت دادەنێن فەرموودەکەی پەروەردگارە کەفەرموویەتی: ﴿وَلِلَّهِ عَلَى النَّاسِ حِجُّ الْبَيْتِ مَنِ اسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلًا﴾ [آل عمران ٩٧]

واتە/خودا حەجی فەرز کردووە لەسەر خەڵکی کە حەجی

ماڵی خوا بکەن، لەسەر ئەوەی کە توانای ڕێگەی هەبێت، توانایی ماڵی و بەدەنی، لەم ئایەتدا خودا باسی واجبێتی حەجی کردووە، ئەگەر عەمرەش واجب بوایە باسی عەمرەشی لە گەڵ حەجدا دەکرد.

## پاداشتی عەمرە

عەمرە یەکێکە لە پەرستنە گەورەکان کە بەندە لە خوای گەورە نزیک دەکاتەوە و دەبێتە هۆی سڕینەوەی تاوانەکان هەروەکو پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێ) فەرموویەتی: (العُمرَةُ إلى العُمرَةِ كَفَّارَةٌ لِمَا بَينَهُمَا).[1]

واتە/عەمرە بۆ عەمرەیەکی تر دەبێتە هۆی سڕینەوەی تاوانەکانی نێوانیان، مەبەست لە تاوانە بچووکەکانە.

## کاتی عەمرە کردن

عەمرەکردن بەدرێژایی ساڵ دروستە لای زۆربەی زانایان، بەڵام لە ڕەمەزاندا پاداشتەکەی زیاترە، هەروەکو پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێ) فەرموویەتی:

(عُمرَةٌ فِي رَمَضَانَ تَعدِلُ حَجَّةً مَعِي).[2]

واتە/عەمرەیەک لە ڕەمەزاندا وەکو حەجێک وایە لە گەڵ مندا، هەروەها پێش حەج کردنیش دروستە ئەنجام بدرێت،

(١)أخرجه البخاري برقم(١٧٧٣) ومسلم (١٣٤٩).
(٢)أخرجه البخاري برقم (١٧٨٢) ومسلم (١٢٥٦).

وەکو ئیبن عومەر (ڕەزای خوای لێ بێت) فەرموویەتی: (إعتمر النبيُّ (ﷺ) قبلَ أن يحجَّ).[1]

واتە/پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) عەمرەی کرد پێش ئەوەی حەج بکات.

## دووبارکردنەوەی عەمرە لەیەك سەفەردا

زانایان جیاوازیان هەیە کە ئایا دروستە لەیەک سەفەردا چەند عەمرەیەک ئەنجام بدرێت یان نا؟ هەر وەکو لە ئێستادا خەڵکی بە گشتی ئەنجامی دەدەن، کە دەردەچن بۆ (تەنعیم)ئیحرام دەبەستن و عەمرەی تر ئەنجام دەدەن، بەڵام باشتر وایە کە ئەنجام نەدرێت، چونکە ئەم کارە لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا ئەنجام نەدراوە، مەگەر ئەوەی دایکە عائیشە نەبێت کە لە دوای حەجەکەی دەرچوو لە مەککەوە بۆ تەنعیم ئیحرامی بەست و عەمرەی ئەنجام دا، چونکە عەمرەی ئەنجام نەدابوولە پێش حەجەکەی لەبەر ئەوەی کەوتووبووە سوڕی مانگانەوە(عادە)وە.

## پایەکانی عەمرە (أركان العُمرَة)

١-ئیحرام بەستن.

٢-سوڕانەوە(الطواف).

(١)أخرجه البخاري برقم (١٧٧٤).

٣-کۆشش کردنی نێوان صەفا و مەروا(السعی).

هەر کەسێ یەکێک لەم پایانە ئەنجام نەدات، عەمرەکەی تەواو نییە.

## پێویستییەکانی عەمرە (الوجبات العُمرَة)

١-ئیحرام بەستن لەو شوێنانەی کە دیاری کراوە (المیقات): پێویستە لەسەر ئەو کەسەی نیەتی عەمرەی هەیە، ئیحرام ببەستێت لەو شوێنانەی کە دیاری کراوە، ئەگەر ماڵی لە پێش ئەو شوێنانەوە بوو کە دیاری کراوە، یان ئەوانەی کە بەسەر ئەو شوێنانەدا تێپەر دەبن، بەڵام ئەگەر ماڵی لە شوێنە دیاری کراوەکان نزیک تر بوو لەمەککەوە ئەوە دەس بەجێ لەماڵی خۆیەوە ئیحرام دەبەستێت، وە ئەوەشی کە لە مەککەدایە و خەڵکی مەککە نییە وە ئەوەشی خەڵکی ناوەوەی مەککەیە، دەبێت دەر بچێت بۆ دەرەوەی ناوچەی حەرەم ئیحرام ببستێت وەکو تەنعیم و شوێنەکانی تری نزیک مەککە هەر وەکو چۆن عائیشە(ڕەزای خوای لێ بێت)ئەنجامی دا.

٢-سەر تاشین یان کورت کردنەوەی:سەر تاشین یان کورت کردنەوەی یەکێکە لە پێویستییەکانی عەمرە، بەڵام تاشین باشترە.

## حەرام کراوەکانی هەردوو حەرەم(مەکە و مەدینە)
## (مَحظُـورَات الحَرَمَين)

حەرامە لەزەوی هەر دوو حەرەمدا(مەکە و مەدینە) هەندێ کار ئەنجام بدرێت بۆ ئەو کەسانەی کە تێیاندا دەژین، وەئەو کەسانەشی کە خەڵکی ئەوێ نین و بۆ حەج و عەمرە ئەنجام دان دەچن کە ئەمانەن:

١-ڕاوکردنی ئاژەڵ و باڵندەی حەرەم وە ڕاونانی و یارمەتی دانی کەسانی تر لەسەر ڕاوکردن،

٢-بڕینی دار و درەخت مەگەر بۆ پێویستی بێت.

٣-هەڵگرتنی چەک بۆ جەنگ کردن،

٤-هەڵگرتنی شتی دۆزراوە بۆ کەسانێک کە خەڵکی ئەوێ نین، بەڵام بۆ خەڵکی حەرەم دروستە، بەو مەرجەی پێناسەو باسی بکات، هەر وەکو پێغەمبەری خوا(دروودی خوای لەسەر بێ)دەربارەی ئەمانە فەرموویەتی:

(إِنَّ هَذَا البَلَدَ حَرَّمَهُ اللهُ يَومَ خَلَقَ السَّمَوَاتِ وَالأَرضَ، فَهُوَ حَرَامٌ بِحُرمَةِ اللهِ إلى يَومِ القِيَامَةِ، وَإِنَّهُ لَم يَحِلَّ القِتَالُ لِأَحَدٍ قَبلِي، وَلَم يَحِلَّ لِي إِلاَّ سَاعَةً مِن نَهَارٍ فهوَ حَرَامٌ بِحُرمَةِ اللهِ إِلَى يَومِ القِيَامَةِ، لاَ يُعضَدُ شَوكُهُ، وَلاَ يُنَفَّرُ صَيدُهُ، وَلاَ يَلتَقِط لُقطَتُهُ إِلاَّ مَن عَرَّفَهَا، وَلاَ يُختَلَى خَلاَهَا)) فقَالَ العَبَّاس: يَارَسُولَ اللهِ، إِلاَّ الإِ ذخِرَ فَإِنَّهُ لِقَينِهِم وَ لبُيُوتِهِم، فَقَالَ ((إِلاَّ الإِ ذَخِرَ).[1]

واتە/ بەڕاستی خوای گەورە ئەم وەڵاتەی حەرام کردووە

(١)أخرجه البخاری برقم (١٨٣٤) ومسلم (١٣٥٣).

مار-لە ڕیوایەتێکی تردا ماریش هاتووە.

مشک-جرج و مشکە کوێرەش دەگرێتەوە، والله أعلم.

سەگی هار- پڵنگ و شێر و گورگ و ئەو جۆرە دڕندانە دەگەڕێتەوە، واللە أعلم

تێبینی// ئەم گیانەوەرانە بۆیە فرمان بەکوشتنی کراوە، چونکە زیان بەخشن، کەواتە هەر ئاژەڵێ زیان بەخش بێت دروستە بکوژرێت، واللە أعلم.



لە کۆتاییدا داواکارم ئەم کتێبە ببێتە مایەی خێرێکی بەردەوام بۆ خۆم و ئەو برایانەی کە یارمەتی دەرم بوون لە بڵاوکردنەوەی ئەم کتێبە، بەتایبەتی ئەم مامۆستا بەڕێزانە (م. محمد ملافائق شارەزووری، م. ئامانج کانی بەیتەشی،م. سەربەست لطیف قادرکەرەمی)خوای گەورەپاداشتیان باتەوە،داواکارم لەخودای گەورە لەکەم و کورپییەکانم ببوریت، پاشان ئێوەی خوێنەریش ئەگەر کەم و کورپییەکەم هەبێت.

وآخر دعوانا الحمد لله رب العالمين.

٢٠١٩/١٢/١٨ شەوی/پێنج شەم.

ژ.م:(٠٧٧٠١٢٠٥٣٤٤)

تێبینی:

هەر موسڵمانێک هەڵەیەک یان کەم و کورپیەک لەم پەرتووکەدا دەبینێت خوای گەورە پاداشتی بداتەوە با پەیوەندی بکات بە ژمارە مۆبایل و ڤایبەر (٠٧٧٠١٢٠٥٣٤٤)

## سەرچاوەکان:

١-مصحف المدينة النبوية مـجـمـع المـلـك فـهـد

٢- جامع الكتب التسعة الـبـخـارى ومـسـلم وغـيـرهـما

٣-تـەفسيرى ڕێبەر م.صلاح الدين عبد الكريم

٤-تـەفسيرى ڕامـان م.ئەحمەد كاكە مەحمود

٥-مـوسـوعة الفقة الميسر د.عبدالله الطيار و عبد الله المطلق

٦-فـقـة الـسـنـة الـسـيـد الـسـا بق

٧-الأركان الإسلام والأيمان محمد بن جميل زينو

٨-تـوضيح الأحكام شرح البلوغ المرام عبد الله بن عبد الرحمن البسام

٩-شـرح الرياض الصالحين محمد بن صالح العثمين

١٠-صحيح فقة السنة كمال بن سيد سالم

١١-البدعة أنوعها وأحكامها صالح بن عبد الله الفوزان

١٢-المسك الختام شرح عمدة إلاحكام زايد بن حسن الوصابي

١٣-دليل الحاج والمعتمر طلال بن أحمد العقيل

١٤- مغـنـي الـمـحـتـاج الـخـطـيـب الشربيني

١٥-الادلة الرضية لمتن الدرر البهية محمد صبحي حسن الحلاق

## Tanya Haji | تەنیاحاجی

public channel



**Description**

بسم الله الرحمن الرحیم

🤍چەناڵێک تایبەت بە کتێب و بابەتی جیاواز🤍

Queen city
شاری شاژن
شارێک تایبەت بە کۆمەڵگایەکی جوان

لەلایەن ئاڤان بەهجەت کراوە بە pdf
بۆ خوێنەران

چەناڵ
https://t.me/tanyahaji7

بۆ ڕاوبۆچون و پسیار بۆ کتێب مەینێرە↓
@tanyahaji22

ئەکاونت↓
https://linktr.ee/tanyahaji22

ئیسلام دامەزراوە لەسەرپێنج پایە:شایەتی دان بەوەی کە هیچ پەرستراوێك بەڕاست (حق) نییە جگە لە(اللّٰه)، وە محمد(ﷺ). نێردراوی پەروەردگارە-وە نوێژکردنە-وە زەکات دانە- وە حەج کردنی ماڵی خودایە-وە ڕۆژو گرتنی مانگی ڕەمەزانە)

أخرجه البخاری ومسلم